# خەلیفەی داهاتووت بناسە




نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی




نوێکراوەتەوە


١٤٤٠کۆچی _ ٢٠١٩زاینی



# خەلیفەی داهاتووت بناسە


نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

ئامادەکردنی

خادم الإسلام



١٤٤٠ کۆچی / ٢٠١٩ زاینی

# ناوەڕۆک

فَهَلْ يَنْتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَانْتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُمْ مِنَ الْمُنْتَظِرِينَ

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

هۆکار و پاڵنەری سەرەکی نوسینی ئەم باسە (محمدی مەهدی) لەبەر چەند هۆکارێکی گرنگ بوون، لەوانە دەرکەوتنی زۆرینەی نیشانە بچووکەکانی پێش هاتنی قیامەت و گۆڕانی کەش و هەوا و فیتنەکانی جیهان بەگشتی و ئەم ناوچەیە بەتایبەت هەروەها دەرکەوتنی کەسایەتی گرنگ و دەرنەکەوتوو لەوانەش کەسێک کە زۆرینەی سیفەتەکانی "مەهدی" تێدایە.

هەروەها خاڵی زۆر گرنگ ئەوەیە کە ئەم باسە وەکو زۆرینەی باسەکانی دی نووقم کراوە لە (قیل و قال) و شتی بێ بنەما تەنانەت وایان لەم خەڵکە کردووە نابێت ئەم باسە وا بە تەفسیلی هەربکرێت، هەربۆیە دوای یارمەتی الله توانیم لەزۆرترین سەرچاوەی ڕاست و دروست، دوای گەڕانێکی زۆر پووختەیەکی گرنگ و وردی ئەم باسەتان بۆ ئامادەبکەم لەم باسەدا تەنیا ئەم بەش و باسانەی گرنگ بوونە باسم کردوون و زۆر بەدوور و درێژیش باسم نەکردووەتەوە. لەکۆتاییدا داواکارم لە الله تعالی بیکاتە توێشووی دوارۆژ.

والحمدالله رب العالمين...

**✍ أبی عبدالله کوردستانی**

**هەینی ١ی جمادی دووەم ١٤٤٠ کۆچی**

**١ی شوباتی ٢٠١٩ زاینی**



## بەشی یەکەم

الحمدالله والمنه، سوپاس بۆ الله تعالی، ئەمە سەرجەم زنجیرە بەشەکانی "مەهدی"یە. لەم بەشەدا کە خۆی لە شانزە زنجیرە دەبینێتەوە، ئەمە بەرهەمی چەندین مانگمە، داواکارم لە الله تعالی لێمان قبوڵ بکاتن، هەروەها لەکەموکوڕی و هەڵەکانمان ببورێت.

لەم زنجیرەیەدا پوختەی زۆرترین سەرچاوەی ڕاست و دروستم تیادا بەکارهێناوە کە خۆی دەبینێتەوە لەمانە:

- (البدایه والنهایه) إبن کثیر
- (المهدی وقرب ضهوری)
- (أشراط ساعة) لشیخ یوسف بن الوابل
- (نهایه العالم) محمد العریفی
- (کتاب فتن) لنعیم بن حماد المروزی
- (أربعون حدیث عن مهدی) أصبهانی
- لەگەڵ فەرموودەکانی "بخاری و مسلم و أبو داود و أحمد"
- لەگەڵ چەندین سەرچاوەی ئەنتەرنێت و مەقالە و فەیسبووک، هتد...

ئەمە پووختەی هەموویانە، لەگەڵ هەندێک لێکدانەوەی خۆم بەپێی واقع و گرێدانی بە فەرموودە. تائێستا پێموایە بەمشێوە نووسینە ناڵێم کەس نەیکردووە، بەڵکو کراوە و ووتراوە، بەڵام بەمشێوە پووختە هەرگیز بەرچاوتان نەکەوتووە. الحمدالله بفضل الله، الله ئەم خزمەتەی پێبەخشین. داواکارم زۆربە وردی بیخوێننەوە و لێی وردبنەوە. داواکارم لە الله لەهەڵە و کەموکوڕییەکانمان ببورێت، چونکە ئێمەی مرۆڤ بەردەوام هەڵە دەکەین.

## زنجیرەی یەکەم: ئایا لەبەرچی "مەهدی" ئاوا گرنگی پێدراوە؟

سەرەتا تەنیا پێشەکییەکە لە ڕوونکردنەوە لەسەر ئیمام "مەهدی". ئەویش تەنیا نیشایەکە لە نیشانەکان و لەڕاستیدا ئیمام (المجاهیدین مهدی) علیه سلام ڕاستە نیشانەیەک لە نیشانەکانە وەکو نیشانەکانی تری پێش قیامەت، بەڵام:

١. رسول الله تەنیا لەم نیشانەیە گوتوویەتی (أبشرکم)، واتە مژدەی پێداوین بە هاتنی. دواتر بإذن الله باسی دەکەین. واتە گەورەترین خۆشییە بۆ ئەهلی حەق کە (ئیمانداران)، چونکە بإذن الله دواتر لە باسەکەیدا دەزانن کە (مهدی) لەکاتی جەور و ستەمدا بەرامبەر بەموسڵمانان دەردەچێت، هەربۆیە پێغەمبەر ﷺ پێمان دەڵێت، واتە بۆ ئەهلی ئیسلامە ئەم مژدەیە.

٢. دواین نیشانەی بچووکی قیامەت و سەرەتای یەکەم نیشانەی گەورەیە، واتە کلیلی هەموو نیشانە گەورەکانی پیش قیامەتە، وەکو نموونەی (تەسبیح) وایە لەگەڵ پچڕان و کەوتنی یەکەم دەنك هاتنی هەموویانی بەدواوەیە. لە ئێرەشدا "مەهدی" هاتنی "دەججال" و "عیسا" علیه السلام قیامەتی گەورەی لە دوایە.

٣. سەرکەوتنی یەکجارەکی ئەهلی حەقە، واتە ئیمانداران بەسەر ئەهلی باتڵ دایە بۆ هەمیشە. بەڵێ بێگومان زەوی و تەنانەت ئاژەڵەکانیش دەکەوننە خۆشییەوە لەبەر جێبەجێکردنی حوکمی الله عزوجل و دادپەروەری.

هەروەها نمونەیەک کە لەوانەیە زۆربەتان ئەمجۆرە قسەتان پێ وترابێت پێشتر. ئەگەر شتێک ببوایە دایک و باوک و دەوربەر دەیان ووت کاکە خۆ سەردەمی محمدی مەهدی نییە. هەتا گورگ و مەڕ پێکەوە ئاوبخۆن! بەڵێ تەنانەت پیاو لەسەر پشتی شێر بێت ئازاری پێناگات. کەواتە ئەم بابەتە لەبەرئەوەی لای هەموو زانایانی ئوممەت گرنگییەکی تایبەتی

پێدراوە، چاوێکی زۆری کذاب و کوفری لەسەربووە بەردەوام چونکە تائێستا چەندین کەس ئیدیعایەی مەهدییەتیان کردووە.

## زنجیرەی دووەم: پێگەی مەهدی لەڕوانگەی شەرعەوە.

یەکێک لە بابەتە هەرە گرنگ و هەستیارەکان بابەتی "مەهدییە"، کە ئەم بابەتە لای زۆرێک لە زانایان زۆر بەهەند وەرگیراوە. هەروەها مەرج نییە هەر کەسێک کە شارەزابێت لە دین، واتە علومی شرعی شارەزابێت لەبارەی مەهدییەوە، لەبەرئەوەی علومێکی سەربەخۆیە. هەروەها ورد و پڕ کۆداتە، واتە هەموو کەسێک ناتوانێت لێی تێبگات و لێکی بداتەوە تەنیا ئەوکاتەی کە لەسەری دەخوێنیتەوە ولێی وورد دەبیتەوە.

هەروەها لەبارەی "مەهدی"یەوە فەرموودەمان زۆرە هەم لە (صحیح) هەمیش لە (ضعیف) و لە (موضوع)یش. هەروەها بەشێک لەزانایان دەڵێن مەهدی پلەی (متواتر)ی معنوی هەیە. تەنانەت لە ناو مفسیرە بەڕێزەکان گرنگی پێدراوە و باسکراوە. بۆیە لێرەدا دەمەوێت بە (تدرج) واتە پلە بەپلە باسی بکەین لە سەرەتادا بەپێی قورئان دواتر بەپێی فەرموودە، دواتریش ئەو کتابانەی کە لەسەری نوسراون. بۆیە داوام وایە تا لێی ووردنەبنەوە و لێی نەکۆڵنەوە خودی خۆتان بڕیار مەدەن.

**لەسەرەتادا دەڕۆینە سەرباسی "مەهدی" لەقورئاندا:**

ئایا زانایان چۆن تفسیریان بۆ مەهدی کردووە؟

کێن ئەو زانا و موفەسیرانەی کە تەفسیریان لێکداوەتەوە بە مەهدی؟

**١- ئیمامی "جریر بن طبری":**

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا لەبارەی سزای دنیایی دەڵێ بە دەرچوونی مەهدی دەبێت.
واتە هیچ کەسێک نامێنێت تەنیا دەبێت داخڵی ئیسلام ببێت. تەفسیری ئەم ئایەتە،
ئایەتی (١١١) سورەتی البقرە :

قال تعالی الله: ﴿لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ﴾[١] واتە الله سزای ڕسواییکەر و زەلیلیان تووش
دەکاتن لە دنیا و جگە لە سزا گەورەکەی قیامەت.

حَدَّثَنَا الْحَسَن، قَالَ: ثنا عَبْد الرَّزَّاق، قَالَ : أَخْبَرَنَا مَعْمَر، عَنْ قَتَادَة: ﴿لَهُمْ فِي الدُّنْيَا
خِزْيٌ﴾ قَالَ: يُعْطُونَ الْجِزْيَة عَنْ يَد وَهُمْ صَاغِرُونَ[٢].

حَدَّثَنَا مُوسَى، قَالَ: ثنا عَمْرو، قَالَ: ثنا أَسْبَاط، عَنْ السُّدِّيّ قَوْله: ﴿لهم في الدنيا خزي﴾
أَمَّا خِزْيهمْ فِي الدُّنْيَا: فَإِنَّهُمْ إذَا قَامَ الْمَهْدِيّ وَفُتِحَتْ القسطنطينية قَتَلَهُمْ، فَذَلِكَ الْخِزْي[٣].

### ٢- ئیمامی حافظ "إبن كثير":

بەهەمان شێوە ئیمامی "إبن كثير" دیسانەوە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا، واتە ئایەتی
(١١١) سورەتی البقرە. هەروەک چۆن شێخی موفەسیرین ئیمامی "طبری" تەفسیری
ئەم ئایەتی بە دەرچوونی "مەهدی" ناساند بەهەمان شێوەش ئیمامی موفەسیری
ئیسلام "إبن كثير" هەر بەدەرچوونی مەهدی ناساند.

قال تعالی: ﴿لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ﴾ واتە سزایەکی سەرشۆڕکەریان دەبێت لە دنیادا.

---

١ سورة البقرة : الآية (١١٤)
٢ تفسير الطبري: (١٥١٨)
٣ تفسير الطبري: (١٥١٧)

﴿وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ مَنَعَ مَسَاجِدَ اللَّهِ أَنْ يُذْكَرَ فِيهَا اسْمُهُ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَا ۚ أُولَٰئِكَ مَا كَانَ لَهُمْ أَنْ يَدْخُلُوهَا إِلَّا خَائِفِينَ ۚ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾[1]

تفسير "ابن كثير": وَفَسَّرَ هَؤُلَاءِ الْخِزْي مِنْ الدُّنْيَا بِخُرُوجِ الْمَهْدِيّ عِنْد السُّدِّيّ وَعِكْرِمَة وَوَائِل بْن دَاوُد وَفَسَّرَهُ قَتَادَة بِأَدَلْجِزْيَة عَنْ يَد وَهُمْ صَاغِرُونَ.

**ئیمامی "ابن کثير"** لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.

وقال تعالى: ﴿وعد الله الذين آمنوا منكم وعملو الصالحات ليستخليفنهم في لارض﴾[2]

لێرەدا ئەم ئایەتە بەر لە هاتنی قیتال بوو دژی موشریکان. دواتر الله سەریخستن بەسەر کافرانی جیهان. ئنجا لەسەردەمی هەر چوار خەلیفەکەدا زوربەی زەوی فەتح کرا. هەروەها لە کۆتایدا جارێکی تر هەموو زەوی دەکەوێتەوە دەستی موسڵمانان ئەویش بە دەرچوونی مەهدی دەبێت.

تفسير "ابن كثير": وَوَقَدْ وُجِدَ مِنْهُمْ أَرْبَعَة عَلَى الْوَلَاء وَهُمْ أَبُو بَكْر ثُمَّ عُمَر ثُمَّ عُثْمَان ثُمَّ عَلِيّ رَضِيَ اللَّه عَنْهُمْ ثُمَّ كَانَتْ بَعْدهمْ فَتْرَة ثُمَّ وُجِدَ مِنْهُمْ مَنْ شَاءَ اللَّه ثُمَّ قَدْ يُوجَد مِنْهُمْ مَنْ بَقِيَ فِي الْوَقْت الَّذِي يَعْلَمهُ اللَّه تَعَالَى وَمِنْهُمْ الْمَهْدِيّ الَّذِي اِسْمه يُطَابِق اِسْم رَسُول اللَّه ﷺ وَكُنْيَته كُنْيَته يَمْلَأ الْأَرْض عَدْلًا وَقِسْطًا كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا.

لە تەفسیری ئەم ئایەتدا ئیمامی "إبن کثیر" ئاماژە بەوە دەکاتن کە "مەهدی" ناوی، هەروەها ناسراوی، واتە کونیەی مطابقە لەگەڵ رسول الله ﷺ.

---

١ سورة البقرة: الآية (١١٤)

٢ سورة النور: الآية (٥٥)

### ٣- ئیمامی "قرطبی":

یەکێکی تر لە ئیمامە موفەسیرە گەورەکانی ئیسلام لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا.

﴿هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾[1]

ئەم ئایەتە تەفسیر دەکاتن بەهاتنی مەهدی، واتە

الذي أرسل رسوله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله ولو كره المشركون قوله تعالى: ﴿هو الذي أرسل رسوله﴾ يريد محمد ﷺ.

﴿بالهدى﴾ أي بالفرقان.

﴿ودين الحق ليظهره على الدين كله﴾ أي بالحجة والبراهين. وقد أظهره على شرائع الدين حتى اليخفى عليه شيء منها، عن ابن عباس وغيره.

وقيل: ﴿ليظهره﴾ أي ليظهر الدين دين الإسالم على كل دين. قال أبو هريرة والضحاك: هذا عند نزول عيسى عليه السلام. وقال السدي: ذاك عند خروج المهدي، ال يبقى أحد إلا دخل في الإسلام أو أدى الجزية.

### ڕوونکردنەوە:

ئەم موفەسیرانە کۆڵەکەی واتە بناغەی تەفسیری ئیسلامن. هیچ کەسێک ناتوانێت ئینکاری بکات، واتە هەم موفەسیر و هەمیش موحەدیث بوونە، بۆنمونە ئیمامی "طبری": قال عنه الخطيب البغدادي: كان أحد أئمة العلماء، يحكم بقوله، ويرجع إلى رأيه لمعرفته

١ سورة التوبة: الآية (٣٣)

وفضله، وكان قد جمع من العلوم ما لم يشاركه فيه أحد من أهل عصره، وكان حافظا لكتاب الله، عارفا بالقراءات كلها، بصيرا بالمعاني، فقيها في أحكام القرآن، عاملا بالسنن وطرقها: صحيحها وسقيمها، وناسخها ومنسوخها، عارفا بأقوال الصحابة والتابعين ومن بعدهم قل أن ترى العيون مثله...، عارفا بأيام الناس وأخبارهم.

ئنجا ڕاستەوخۆش دان یان نا بە هاتنی "مەهدی"دا دەنێت. هەروەها لە کۆتاییدا، واتە پووختەی ئەم تەفسیرانە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە الله تعالى حوكمی ئەم دینە لەسەردەستی یەکێک لەسەر هەموو زەوی دەچەسپێنێت ئەویش مەهدییە. ناوی و نازناوی دەتوانین بڵێین ئەفضل تر وەکو پێغەمبەرە ﷺ.

## زنجیرەی سێیەم: کەی دەردەچێت؟

لە سەرەتادا ئەم بەشەمان پێشخست، واتە جێگای لەزنجیرەکانی داهاتووە، بەڵام بۆ زیاتر ڕوونتربوون لای زۆرێک چونکە پرسیار دەکەن دەڵێن، ئایا ئەم ساڵە یان ساڵێکی دی یان چەند ساڵی دی؟ کە ئەمەش بەجێیە، بەڵام ئەم بابەتانە زۆرمەترسیدار و هەستیارن، واتە ناکرێت بێ بەڵگەی مەلموس و قەطعی ڕاستەوخۆ بڵێی ئەمساڵە یان فلان ساڵە، لەبەرئەوەی بابەتێکی غەیبیە! چونکە قال تعالى الله: ﴿وما تدري نفس ماذا تكسب غدا﴾[1]

کەواتە هیچ نەفسێک نازانێت بەیانی چی چاوەڕێیەتی. بەڵام لەبارەی نیشانەکانی پێش قیامەت و "مەهدی" جۆرێکی ترە، واتە الله تعالى بۆ ئەم مەسائیلانە (مرج) واتە نیشانەی

[1] سورة لقمان: الآية ٣٤

داناوە. ئەگەر دەرکەوت دەزانیت دوای ئەو چی دێت و چی دەبێت! ئەمەش (إستسناء)تایبەتە بەم لایەنەوە.

بێینە سەر وەڵامی ئەم پرسیارە، بەڵێ الحمدالله لەم دینەدا تەواو بێ کەموکورتە، هەرچییەکت لا مەبەست بێت تێیدایە و بەدەستی دەهێنیت. دەگەڕێینەوە بۆ فەرموودە، بەڵێ لەلایەن رسول الله وە ﷺ بۆمان دیاریکراوە و کاتی داناوە. عن معاذ بن جبل رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: (عمران بيت المقدس، خراب يثرب، وخراب يثرب، خروج الملحمة، وخروج الملحمة، فتح القسطنطينية، وفتح القسطنطينية، خروج الدجال ثم ضرب معاذ بيده على فخذ الذي حدثه-أو منكبه- ثم قال:إن هذا لحق كما أنك قاعد هاهنا).

با بزانین لەم فەرموودەیەدا چی بەدی دەکەین و بۆمان دەردەکەوێت ئەم فەرموودەیە، ئەمەش یەکێکە لەفەرموودە زۆر تایبەت و یەکێکە لە نیشانە (مختلط)[1] ەکان دەگمەنەکان لەم بارەوە، چۆن؟!

**بەشی یەکەمی فەرموودەکە: [عمران بيت المقدس]**

تێکدان و ڕووخانی "قودس"، ئەمە یەکێکە لە نیشانەی بچووکەکان. لێرە مەبەست ئەوەیە جوولەکە دەیەوێت بێگەڕێنێتەوە سەر شێوەی پێشتر بیڕوخێنێت و (هيكل سليمان)[2] دروست بکاتن. بەڵێ کە جولەکە لەئێستادا زۆر چاوی بڕیووەتە ڕووخانی

[1] واتە تێکەڵ لە نیشانەی بچووک و گەورەیە.

[2] ئەو کۆشکەیە کە جولەکە پیلانیان داناوە "مسجد الأقساء - بيت المقدس" بۆ بڕوخێنن و لە شوێنەکەیدا بنیاتی بنێن بۆ خوا کوێرە یەک چاوەکەیان کە "دەججالە".

بۆئەوەی "هیكل سلیمان"ی لێدروست بكاتن. تەنانەت كاركردنەكان بەئاشكراش هەستی پێدەكرێت.

**بەشی دووەمی فەرموودەكە: [**خراب یثرب**]**

لێرەدا مەبەست لەتێكدانی"مدینە"یە، هەروەها كاولبوونیەتی ئەمیش بەهۆی شەڕەوە،كە واللە تعالی أعلم لە ساتی دەركەوتنی ئیمام "مەهدی"دا دەبێت.

**بەشی سێیەمی فەرموودەكە: [**خروج الملحمە**]**

لێكەوتەی ڕووخانی "قودس" دەبێتە هەڵگیرسانی گەورەترین جەنگی مرۆڤایەتی لە نێوان كوفر و ئیمان كە لە (دابق)[1] كە ئەمەش نیشانەی گەورەی قیامەتە.

ئنجا لێرەدا كوفر بەسەركردایەتی (ڕۆم) ئەمریكا و ئەوروپا، هەروەها ئیمان بەسەركردایەتی (إمام المجاهیدین)، خەلیفەی ئاخر زەمان مەهدی "محمد بن عبداللە"یە، اللە أكبر اللهم آجعلنا في الإیمان، اللهم آمین.

بەڵێ ئەمەش ڕووخانی "قودس"، نیشانەی بچووكە و بە نیشانەی گەورە خۆی دەبینێتەوە. دڵنیاشبن لە ئێستادا لە زۆر لاوە و چەندین ساڵە دەڵێن بەمزووانە جەنگی جیهانی سێیەم ڕوودەدات. ئەمەش حەقیقەتی ئەم جەنگەیە.

**بەشی چوارەمی فەرموودەكە: [**فتح القسطنطینیة، خروج الدجال**]**

١ اعماق یان دابق ئەو ناوچەیەیە كە دەكەوێتە شام (سوریا)ەوە، لەشكری ڕۆم تیایدا دادەبەزننەوە بەرامبەر بە لەشكری موسڵمانان لە جەنگی( ملحمە عظمی)دا.

هەردووکیان نیشانەی گەورەن و دوای هاتنی مەهدین، یەکەمیان لەلایەن "مەهدی"یەوە (قسطنطینیه)[1] لەلایەن ٧٠ هەزار لە نەوەکانی (ئیسحاق)[2] بەسەرکردایەتی ئیمام، تەنها بە ووتنی (الله أكبر) ئازادی دەکەن. دواتر دەرکەوتنی گەورەترین فیتنەی کەون کە "دەججال"ە بە دوایدادێتن.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم نیشانانە لە یەک فەرموودەدا بە یەک زنجیرە هاتوونەتە خوارەوە، واتە دەرکەوتنی یەکەمیان کە (عمران بيت المقدس)ە لە کۆتاییدا "دەججال"ی لێدەر دەکەوێتن. الله أكبر سبحان الله، واتە وەکو (تەسبیح) هەمووی بەدوای یەکدا دێن.

**تێبینی:**

دواتر کردنە پایتەختی قودسی موسڵمانان لەلایەن ئیسرائیلەوە بووە یەکەم هەنگاو بۆ دروستکردنی و جێبەجێکردنی پڕۆژەی (هيكل) جگە لەوەش ئێمە (أثر)ێکی زۆر بەهێزمان بەهۆی ئەوەی کە واقعیەتەکەی هاتووەتەدی. زیاتر بەهێزی کردووە ئەمیش لەبارەی (برهە من دهرم) کە ئێستا لە کۆتایی بورهەکەداین والله أعلم. دواتر لە بەشێکدا بە وردی باسی دەکەین کە لە بارەی (عائذی یەکەم) کە "محمد بن عبدالله القحتانی" بوو ڕوویدا، پاشان (عائذی دووەم) کە والله اعلم "مەهدیە".

بەپێی ئەم (أثر)ەبێت ئێستا نزیکترین کاتین لە (عائذی دووەم). بەڵام لەهەموو بوارەکان چاوەکان دەبێت لەسەر "قودس"بێت چونکە مەرجە تەنانەت گەر سەد ساڵی کەشبێت،

---

١ ئەستەنبوڵی ئێستا دەکات.

٢ بریتین لە ڕۆمە موسڵمانەکان (مەبەست لە ڕۆم خەڵکی ئێستای ئەوروپا و ئەمەریکایە).

ئەمەش قاعیدەی شرعیە!! کەواتە چاوتان لەسەر ڕووخانی قودس بێت ئەگەر ئەمساڵ بێت، کە ئەمساڵیش نییە والله أعلم یان ساڵێکی دی یان زیاتر، بەمشێوە بۆتان ڕووندەبێتەوە و سەریشتان لێ تێک ناچێت. ئنجا لە هەموو بوارەکان بەهۆی دەرکەوتنی زۆربەی زۆری نیشانە بچووکەکان ئێمە لە ئێستادا زۆر نزیکین لە دەرکەوتنی.

## زنجیرەی چوارەم: مەهدی لەفەرموودەکاندا.

کۆمەڵێک لەو فەرموودانە کە بە ڕاستی و تەواوی لەسەری هاتوون. لێرەدا ئەم فەرموودانە هەمووی پلەی ڕاستیان (صحیح) هەیە، دواتر بإذن الله خاڵ بەخاڵ باسیان دەکەین:

١- عن أبي سعيد الخدري، قال: قال رسول الله ﷺ: (المهدي مني، أجلى الجبهة، أقنى الأنف، يملأ الأرض قسطا وعدلا، كما ملئت جورا وظلما، يملك سبع سينين....)[١].

٢- (الْمَهْدِيُّ مِنَّا أَهْلَ الْبَيْتُ يُصْلِحُهُ اللهُ فِي لَيْلَةٍ)[٢].

واتە مەهدی لە ئال و بەیتی منە، خوای گەورە پلە و شکۆی لە یەک شەودا بەرز دەکاتەوە.

واتای ئەوە دەگەیەنێت کە سەرەتا خۆشی خۆی ناناسێت کە مەهدییە. لە داهاتوودا لە بەشێکی تایبەت بإذن الله زۆر بەووردی باسی ئەم وشە دەکەین.

---

١ إسناده، حسن. رواه، أبي داود.

٢ المسند (٢ /٥٨) بسند صحيح عن إبراهيم بن محمد ابن الحنفية عن أبيه عن علي رضي الله عنهم السلسلة الصحيحة.

٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (أُبَشِّرُكُمْ بِالْمَهْدِيِّ يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ وَزَلَازِلَ، فَيَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَرْضَى عَنْهُ سَاكِنُ السَّمَاءِ وَسَاكِنُ الْأَرْضِ، يَقْسِمُ الْمَالَ صِحَاحًا فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: مَا صِحَاحًا؟ قَالَ : بِالسَّوِيَّةِ بَيْنَ النَّاسِ، قَالَ: وَيَمْلَأُ اللَّهُ قُلُوبَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ غِنًى، وَيَسَعُهُمْ عَدْلُهُ، حَتَّى يَأْمُرَ مُنَادِيًا فَيُنَادِي، فَيَقُولُ : مَنْ لَهُ فِي مَالٍ حَاجَةٌ، فَمَا يَقُومُ مِنَ النَّاسِ إِلَّا رَجُلٌ، فَيَقُولُ: أنا، فيقول: ائْتِ السَّدَّانَ، يَعْنِي الْخَازِنَ، فَقُلْ لَهُ: إِنَّ الْمَهْدِيَّ يَأْمُرُكَ أَنْ تُعْطِيَنِي مَالًا، فَيَقُولُ لَهُ: احْثِ حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ فِي حِجْرِهِ وَأَبْرَزَهُ نَدِمَ، فَيَقُولُ : كُنْتُ أَجْشَعَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ نَفْسًا، أَوَعَجَزَ عَنِّي مَا وَسِعَهُمْ؟ قَالَ: فَيَرُدُّهُ، فَلَا يَقْبَلُ مِنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: إِنَّا لَا نَأْخُذُ شَيْئًا أَعْطَيْنَاهُ، فَيَكُونُ كَذَلِكَ سَبْعَ سِنِينَ أَوْ ثَمَانِ سِنِينَ أَوْ تِسْعَ سِنِينَ، ثُمَّ لَا خَيْرَ فِي الْعَيْشِ بَعْدَهُ، أَوْ قَالَ: ثُمَّ لَا خَيْرَ فِي الْحَيَاةِ بَعْدَهُ)[١].

واتا لە "أبی سەعیدی خودریەوە" رضی الله عنه دەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: مژدەتان دەدەمێ بە "مهدی" لەناو ئوممەتەکەمدا دێت و لەکاتی ناکۆکی نێوان خەڵکی و بومەلەرزەدا دێت. زەوی پڕ دەکات لە ڕاستی و دادپەروەری، هەروەک چۆن پڕبوو بوو لە زوڵم و ستەم. لێی ڕازی دەبن دانیشتوانی ئاسمان و دانیشتوانی زەوی. پارە و سامان بە ڕێکی دابەش دەکات.

- پیاوێك وتی: بەڕێکی چۆنە؟

- فەرمووی: بە یەکسانی لەنێوان خەڵکیدا، ئنجا فەرمووی: خوای گەورە دڵی ئوممەتی محمد ﷺ پڕ دەکات لە دەوڵەمەندی و دادپەروەریەکەشی هەموویان دەگرێتەوە، هەتا

١ حديث حسن، رواه أحمد في المسند ورجاله رجال صحيح.

بانگ دەرێک بانگ دەکات کێ پێویستی بە پارە و سامانە؟ هیچ کەسێک لە خەڵکی هەڵناستێت و ناچێت بەدەم ئەو بانگەوازەوە بێجگە لە یەک پیاو نەبێت.

- دەڵێت: من.

- ئەویش پێی دەڵێت: برۆ بۆ لای خەزنەدار و پێی بڵێ: مەهدی فەرمانی پێ کردووی تا پارەم پێبدەیت.

- ئەویش پێیدەڵێت: هەڵی رێژە و هەتا کاتێک دەیکاتە کۆشیەوە.

- ئەویش پەشیمان دەبێتەوە و دەڵێت: من پیسکەترین کەسی ئوممەتی محمد ﷺ بووم و دەشڵێت: دەیگێڕمەوە و ئەوانیش لێی وەرناگرنەوە.

- پێی دەڵێن: ئێمە کە شتێکمان بەخشی وەریناگرینەوە.

بەوجۆرە لەناوتاندا ساڵ یان هەشت ساڵ یان نۆ ساڵ. پاشان هیچ خێر و خۆشییەک نامێنێت لە پاش ئەو یان وتی: هیچ خێرێک لە ژیاندا نابێت پاش ئەو.

کەواتە لەم سێ فەرموودەیەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو کەسەی خەلیفەی کۆتایی ئیسلامە نازناوی (المهدی)، هەروەها لە ئال و بەیتی رسول الله یە ﷺ. ئەمەش بەم دەلیلە قەطعی و مەملوسانە.

٤- عن سعيد بن المسيب عن أم سلمة قالت: سمعت رسول الله رسول الله ﷺ يقول: (المهدي من عترتي، من ولد فاطمة. قال عبدالله بن جعفر: وسمعت أبا المليح، يثني على علي بن نفيل، ويذكر منه صالحا).

واتە مەهدی لە نەوەی کوڕەکانی "فاتیمە"یە رضی الله عنها لەنێو کوڕەکانیدا لە نەوەی ئیمامی "حسن"ە رضی الله عنه. کەواتە لە ئالو بەیتە و قوڕەیشیشە.

٥- عن عبد الله، عن النبي ﷺ قال: (لو لم يبق من الدنيا إلا يوم. قال زائدة في حديثه: لطول الله ذلك اليوم، ثم اتفقوا حتى يبعث فيه رجال مني أو من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي، و اسم أبيه اسم أبي زاد في حديث فطر: يمأل الأرض قسطا وعدلا كما ملئت ظلما وجورا).

واته گەر بێتو دنیا تەنیا ڕۆژێکی مابێت، ئەوا ئەم ڕۆژە درێژ دەکاتەوە، تاوەکو پیاوێک دەردەچێت لە من واتە لە نەوەکانی منە. ناوی وەکو ناوی منە، ناوی باوکیشی وەکو ناوی باوکمە واتە "محمد عبدالله" زەوی پڕدەکات لە دادگەری هەروەک چۆن پڕبوو بوو لە ستەم و نادادی.

٦- يَقْتَتِلُ عِنْدَ كَنْزِكُمْ ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمْ ابْنُ خَلِيفَةٍ ثُمَّ لَا يَصِيرُ إِلَى وَاحِدٍ مِنْهُمْ ثُمَّ تَطْلُعُ الرَّايَاتُ السُّودُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قَوْمٌ ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا لَا أَحْفَظُهُ فَقَالَ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ وَلَوْ حَبوًا عَلَى الثَّلْجِ فَإِنَّهُ خَلِيفَةُ اللهِ الْمَهْدِيُّ[١].

واتا سێ کەس لا گەنجینەکەی ئێوە دەکەونە شەڕەوە هەر هەموویان لە کوڕانی خەلیفەن. پاشان ئەو گەنجینەیە نابێت بە موڵکی هیچ کامێک لە ئەوان، دواتر لەلای خۆرهەڵاتەوە ئاڵا ڕەشەکان دەردەکەون جەنگێکتان لەگەڵدا دەکەن کە کەس جەنگی وای نەکردبێت. پاشان "سەوبان" دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ شتێکی وت کە بەڕاستی لە بەرم نەکرد فەرمووی کاتێک بینیتان بچن بەیعەتی پێ بدەن هەرچەندە بە گاگۆلکێش بڕۆن بەسەربەفردا.

١ سنن ابن ماجة كتاب الفتن باب خروج المهدي (٢/١٣٦٧). وستدرك الحاكم (٤/ ٤٦٤-٤٦٣) وقال هذا حديث صحيح غلى شرط الشيخين ووافقة الذهبي. وقال ابن كثير هذا اسناد قوي صحيح وقال الالباني (الحديث صحيح المعنى دون قوله) فان فيها خليفة الله المهدي.

سەبارەت بەورستەیە (كلهم ابن خليفة) واتە سێ كەس هەر یەک لەوان خەڵكێكی زۆر شوێنیان کەوتوون. هەموو ئەو سێ كەسەش باوكیان مەلیكە ئەوان وەک موڵكی باوكیان داوای موڵک دەكەن. سەبارەت بە گەنجینەی كەعبەش دەڵێن: بریتییە لە گەنجینە ئاڵتوونێكی زۆر كە كەوتووەتە ژێر كەعبەوە. هەندێكیش دەلێن: مەبەستی موڵک یا حوكم یان خەلافەتە هەمیشە دەڵێت گەنجینەكەی فوڕاتە كە شاخە ئاڵتوونەكەی تیا دەردەكەوێت.

٧- يَخْرُجُ فِي آخِرِ أُمَّتِي الْمَهْدِيُّ يَسْقِيهِ اللهُ الْغَيْثَ وَتُخْرِجُ الأَرْضُ نَبَاتَهَا وَيُعْطِي الْمَالَ صِحَاحًا وَتَكْثُرُ الْمَاشِيَةُ وَتَعْظُمُ الأُمَّةُ يَعِيشُ سَبْعًا أَوْ ثَمَانِيًا[١].

واتە لە ئاخری ئومەتی من مەهدی دەردەكەوێت. خوای گەورە بارانی بە ڕەحمەتی پێ دەدات و زەوی بەروبوومی خۆی دەردەكات. ماڵ و سامان بەیەكسانی دەدرێتبە خەڵک و مەڕوماڵات زۆردەبن و ئەو ئوممەتە گەورە دەبێت و خۆیشی حەوت یان هەشت ساڵ دەژیەت.

كەواتە دەردەكەوێت ئەم كەسە كە خەلیفەی كۆتایی موسڵمانانە بە هەرشێوەیەک بێت دەردەكەوێت و ناویشی، باشتروایە یان أفضل ترە كە بڵێین محمد عبدالله یە، لە ئالوبەیتە.

---

١ رواه الحاكم بسند صحيح صحيح عن سعيد الخدري رضي الله عنه السلسلة الصحيحة (٢ /٣٣٦).

## زنجیرەی پێنجەم: مەهدی لە (صحیحین)دا.

لە زنجیرە فەرموودە (صحیح)ەکاندا کە باسی کراوە بەڵێ لە زۆربەی (صحیح) و مسندەکان بەشێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ئاماژەی پێکراوە، لەوانە:

- ❑ بخاری ⇦ ناڕاستەوخۆ
- ❑ مسلم ⇦ ناڕاستەوخۆ
- ❑ أبو داو ⇦ ڕاستەوخۆ
- ❑ ئیمامی أحمد ⇦ ڕاستەوخۆ
- ❑ ترمزی ⇦ ڕاستەوخۆ

هەروەها چەندین پێشەوایانی تری موحەدیثی ئوممەت...

کەواتە نابێت بە هیچ شێوەیەک گومانت لێ هەبێت چونکە گەیشتوونەتە پلەی بنبڕ و (قطعی).

**١- "بخاری" و "مسلم": ناڕاستەوخۆ.**

ئەم فەرموودانە ئاماژەی ناڕاستەوخۆن بۆ ئیمام "مەهدی".

عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: (لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. قَالَ: فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ (عَلَيْهِ السَّلَام)، فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ: تَعَالَ صَلِّ لَنَا، فَيَقُولُ: لَ، إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ، تَكْرِمَةَ اللَّهِ هَذِهِ الْأُمَّةَ).

واتا "جابری کوڕی عبدالله" خوای لێی ڕازی بێت دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: بەردەوام کۆمەڵێک لە ئومەتەکەم لەسەر حەق سەرکەوتووانە دەجەنگن تا ڕۆژی قیامەت. ئنجا "عیسای کوڕی مریم" سەلامی خوای لێ بێت دادەبەزێت. سەر لەشکرەکەیان دەڵێت: وەرە نوێژمان بۆ بکە. ئەویش دەڵێت: نا، ئێوە هەندێکتان لەناو خۆتانا سەرپەرشتیاری هەندێکتانن ئەمەیش ڕێزلێنانێکی خوایە.

**٢- "بخاری" ناڕاستەوخۆ.**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ، فَأَمَّكُمْ مِنْكُمْ). فَقُلْتُ لِابْنِ أَبِي ذِئْبٍ: إِنَّ الْأَوْزَاعِيَّ حَدَّثَنَا عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ: (وَإِمَامُكُمْ مِنْكُمْ). قَالَ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ: تَدْرِي مَا (أَمَّكُمْ مِنْكُمْ)؟ قُلْتُ: تُخْبِرُنِي، قَالَ: فَأَمَّكُمْ بِكِتَابِ رَبِّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى وَسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ صلى الله عليه وسلم)[١].

واتا "أبو هريره" خوای لێی ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حاڵتان چۆن دەبێت کاتێک کوڕی "مریم" دادەبەزێتە ناوتان، پێشەواشتان لە خۆتانە. (ڕاوی) دەڵێت: بە "إبن ذئب"م وت: کە "الاوزاعی" قسەی بۆ کردووم لە "الزهراوی"یەوە، ئەویش لە "نافع"ەوە، ئەویش لە "ابو هريره"ەوە فەرموودەکە بەمشێوەیەیە (وأمامكم منكم). "إبن أبی ذئب" دەڵێت: دەزانیت مانای (أمكم منكم) چییە؟ وتم: پێم بڵێ، وتی: پێشەوایەتیتان دەکات بەقورئان و سوننەتی پێغەمبەرەکەتان.

ئەم فەرموودەیەش کە کۆمەڵێک موحەدیثی ئەم ئوممەتە بە یەکجۆر ڕیوایەتیان کردووە.

١ بخاري/ لانبياء/ ٣

**٣- أحاديث صحيحة صححها الحافظ ذكر فيها المهدي باسمه وبصفاته، منها ما رواه "أحمد" و"الترمذي" و"أبو داود".**

أن النبي ﷺ قال: (لا تذهب أو لا تنقضي الدنيا حتى يملك العرب رجل من أهل بيتي، يواطئ اسمه اسمي، واسم أبيه اسم أبي).

ئەم فەرموودەیە کە کۆمەڵێك موحەدیث هێناویانە دەلالەتە لە ناو و نسبی. إن شاء الله لە بەشەکانی داهاتوودا بەشێوەی نوسین و ڕوونکردنەوی ورد باسی دەکەین.

## زنجیرەی شەشەم: مەهدی کێیە؟

- خەلیفەی ڕاشید مەهدی "محمد عبدالله" عليه سلام.
- پوختەی فەرموودەکان.

لەکۆتایی دنیادا واتە ئاخیری زەمان ئەم خەلیفەیە دەردەکەوێت کە بە خەلیفەی موسڵمانان دادەنرێت و لەگەڵ دەرکەوتنی زەوی پڕ دەکات لە دادپەروەری و خۆشی هەروەک چۆن پڕبوو بوو لە زوڵم و زۆرداری وستەم.

**ناو و نەسبی:**

بێگومان یەکێک لە موعجیزە گەورەکانی ئەم دینە نەهێشتنی حوججەیە لای خەڵکی. واتە ئێمە لە زۆربەی شتەکان ئاگادارکراوین، هەم لە فیتنەوە هەم لە خۆشی و بەشارەت.

**فیتنە:** وەك "دەججال" بۆئەوەی خۆمانی لێ بپارێزین.

**بەشارەت:** وەک "مەهدی" بۆئەوەی شوێنی بکەوین.

١- ناوی "محمد"ە، چونکە هەروەک پێغەمبەر ﷺ بەم ناوە مەشهور بووە.

٢- باوکی "عبدالله"یە.

٣- دایکی "ئامینە"یە.

٤- کنیە: "أبو عبدالله"یە یان "أبو القاسم"ە.

٥- لە ئالوبەیتی پێغەمبەرە ﷺ. هەروەک لە فەرموودەدا دەڵێت (أهل بیتی).

٦- لە (ذریەت) ئەگەڕێتەوە بۆ نەوەی "فاطمة". هەروەها لە نەوەکانی ئیمامی "حسن" و "حسێن"ە، کە ئەمەش لە بەشێکدا ڕوونیدەکەینەوە، ئایا لە نەوەی ئیمام "حسن"ە یان "حسێن"ە.

٧- عەرەبە، ئەمەشیان لە بەشێکدا ڕوونیدەکەینەوە، ئایا عەرەبە یان فارسە یان کوردە.

بإذن الله لە بەشی داهاتوودا سیفەتە کەسییەکانی باسدەکەین.

## زنجیرەی حەوتەم: سیفەتی خودی (شەخصی)یەکانی مەهدی، واتە شێوە و سیفاتە کەسیەکانی.

لێرەدا ئەم بەشەم دەرهێناوە کە لەلایەن برایەک ئامادەکراوە کە کەسێکی زۆر شارەزا و لێهاتووە لەم مجالەدا الله لێی ڕازی بێت. هەروەها کەمێک دەستکاریم کردووە. ئنجا دوای بەدواداچوون هەمووی موتابق بوون لەگەڵ فەرموودەکانی کە لەسەری هاتوون. بۆیە ئەمانە پەیوەستن بە شکڵ و شێوەی ئیمام مەهدییەوە. واتە لەبەرئەوەی بە نەصی

فەرموودە لەسەری هاتووە، بۆیە دەبێت ئەو کەسەی کە دەبێتە مەهدی ئەم سیفەتانەی تێدابێت. ما شاء الله، لەو دینە هیچ بیانوومان بۆ ناهێڵێتەوە.

کاتێک کە الله لە قورئان لە بارەی جوولەکەوە دەڵێت: ﴿یعرفون کما یعرفون أبناءهم﴾[1] هەروەها بۆ ئێمەش هیچ نەهێڵراوەتەوە. بۆنمونە، مەهدی کە کۆتا خەلیفەی ئیماندارانە و یەکەم نیشانەی گەورەی قیامەتە. تەنانەت ڕەنگ و شەکڵ و شێوەشی ڕوونکراوەتەوە.

١- ڕەنگی عەرەبیە، واتا ئەسمەرە و سووراتیەکی تێدایە.

٢- کەچەڵە، هەندێک پرچ لە پێشینەی سەری هەیە. بەڵام (أصلح) واتا سەر ڕووت نییە.

٣- نێوچەوانی پان دیارە، واتا بڵندە وەک هی شێر وایە کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (أجبە). ئەمەش یەکێکە لەناوەکانی شێر.

٤- پرچی ڕەشە و لوولە و درێژە دەگاتە سەر شانی.

٥- دەموچاوی جوان و گەشاوەیە و نوری پێوە دیارە.

٦- لەسەر دەموچاوی هەندێک نیشانە دیارن.

٧- خالێک لەسەر ڕوومەتی ڕاستی هەیە.

٨- برۆیەکانی قەوس و درێژن و لە ناوەڕاست نەگەیشتوون بەیەکەوە.

٩- چاوی گەورە و جوانن و بۆ ناوەوەن و چاوەکانی ڕەشن.

١٠-لووتی لە ناوەڕاستەوە قەوسێکی تێدایە و نزمایەکی بەدوادادێت.

١١-ددانەکانی پێشەوەی ڕەونەقیان تێدایە و لەسەرەوە و خوارەوە بۆشایی لەنێوان ددانەکانی پێشەوەی هەن و بۆشاییەکەش کەم نییە.

١ سورة البقرة: الآیة (١٤٦) سورة الأنعام: الآیة (٢٠)

١٢-زمانی گرانییەکی تێدایە هەمووکەس پێی نازانێت. بەڵام کاتێک وشەیەک لەسەر زمانی گران دەبێت بە دەستی ڕاستی لە ڕانی چەپی دەدات.

١٣-ڕیشی پڕە.

١٤-قیافەی (جسم) "ئیسرائی"یە، توندوتوڵە و ڕێک و پێکە، نە کورتە و نە درێژ و نە قەڵەوە و نە زەعیفە.

١٥-ملی ئەستورە و کورتە.

١٦-نێوان هەردوو شانی پان و بەرینە.

١٧-سینگی کراوەیە و پانە و بەرینە زگیشی پانە.

١٨-هەردوو ڕانی ئەستوورن و لێک دوورن، واتا لەکاتی ڕۆیشتنیدا بەیەکەوە نووساو نین.

١٩-دوو نیشانەی زگماکی (مۆر) هەیە. یەکێکیان لەنێوان هەردوو شانی بۆ لای خوار شانی چەپییەتی، هەروەك هی پێغەمبەر ﷺ.

٢٠-تەمەنی لەنێوان ٣٠ بۆ ٤٠ ساڵە کاتێک دەردەکەوێت.

٢١-لە نێوان تەمەنی ٤٠ بۆ ٥٠ ساڵاندا دەبێت بە خەلیفە.

٢٢-کاتێک خوطبە بخوێنێت دەنگێکی پڕی هەیە.

٢٣-عەمامەیەکی سپی لەسەرە بە لای ڕوومەتێکی شۆڕ دەبێتەوە و بە لای ڕوومەتەکەی تری سەر دەکەوێتەوە سەرێ.

٢٤-جلیشی سپییە.

بەڵگەکان فەرموودەی ڕاست (صحیح) و لاواز (ضعیف) و (أثر)ن.

## زنجیرەی هەشتەم: باسێکی کورت لەبارەی زانای گەورە "نعیم بن حماد المروزی".

ئەم بەشە ڕاستە پەیوەندی بەخودی ئیمام مەهدییەوە نییە. بەڵام گرنگترین بەشە لە باسەکەدا، کە باسی عاملێکە کە زۆربەی فەرموودەکانی لێ وەرگیراون، کە زۆربەیان بەلاواز (ضعیف) دانراون. ئەویش (الراوی المظلوم) حافظ أبو عبدالله ئیمام "نعیم بن حماد المروزی"یە. بۆ ئەو کەسانەی کە نەیان ناسیووە، بەشێوەی خۆی و هەروەها کاتێک کە ناوی فەرموودەکانی دێت لێکدانەوەی خراپی بۆ دەکەن.

### ئەم زانایە کێیە؟

"نعیم بن حماد" یەکێکە لە پیاوانی زانست و طالب العلم و قوتابی فەرموودە. هەروەها هەموو زانا گەورەکانی ئوممەت کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی کە کەسێکی عالم و عابد و زاهد بووە. ئنجا زیرەکترین کەسی سەردەمی خۆی بووە لە فەرائض. یەکەم عالم بووە کە خاوەنی (مصنف) بێت. شێخ و مامۆستای ئیمامی ئوممەت ئیمامی "بخاری"بووە. هەروەها زۆرتووند بووە لەسەر (جەهمی)یەکان و لەسەردەمی خەلیفە "معتصم" ڕەفزی قەولی (خلق قورئان)ی کردووە. هەر بەم هۆیەشەوە خرایە زیندانەوە و هەر لە زیندانیشدا گیانی سپارد. الله تعالی بیخاتە بەر ڕحمی خۆی.

**ئەمەش قەولی کۆمەڵێک زانا لەبارەیەوە:**

قال عنه الإمام الذهبي في السير: هو الإمام العالمة الحافظ أبو عبد الله المروزي الخزاعي صاحب التصانيف.

روى عنه البخاري مقرونا بآخر، و أبو داود و الترمذي وابن ماجه بواسطة ويحيى بن معين وخلق. وهو أول من جمع المسند وصنف فيه.

قال أحمد: كان نعيم كاتبا لأبي عصمة نوح بن أبي مريم، وكان شديد الرد على الجهمية وأهل الأهواء، ومنه تعلم نعيم.

ومن أقوال نعيم المشهورة: من شبه الله بخلقه فقد كفر، ومن أنكر ما وصف به نفسه فقد كفر، وليس فيما وصف الله به نفسه ولا رسوله تشبيه.

توفي نعيم رحمه الله سنة ثالث أو أربع وعشرين ومائتين في السجن بسبب فتنة خلق القرآن، وكان مقيدا فأوصى أن يدفن بقيوده وقال: إني مخاصم. فهذا هو نعيم بن حماد.

بەڵێ ئەمە کورتەیەک لە ژیانی ئەم عاملە فەرامۆشکراوە بوو. بۆیە کاتێک کە وترا (رواه نعيم بن حماد). هەرگیز با فکری خراپ بە مێشکتدا نەیەت، چونکە بیستوومە لە زۆرکەس کە دەڵێن وەکو مەسەلەی فاڵچی وایە لە سەد قسەی یەکێکی دەردەچێت کە ئەمە ئەوپەڕی نادادییە لەم عالمە بەڕێزە. لەواقیعدا بەشێکی ئەم فەرموودانەی کە لاوازیان دانابوو واقعەکەیان ڕوویدا. بۆ زیاتر پاڵپشتی ئەم عالمە ئەم فەرموودەیە، خەبەری پێداوم لەوەی کە ڕوودەدات.

عَنْ حُذَيْفَةَ (رضي الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ، فَمَا مِنْهُ شَيْءٌ إِلَّا قَدْ سَأَلْتُهُ، إِلَّا أَنِّي لَمْ أَسْأَلْهُ: مَا يُخْرِجُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ[1].

---

١ رواه نعيم بن حماد: (١٩١٠)

واتا "حذيفة" خوای لێ ڕازی بێت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خەبەری پێداوم لەوەی کە ڕوودەدات تا ڕۆژی قیامەت. هیچ شتێک نەماوەتەوە ئیلا پرسیارم لێکردووە دەربارەی. تەنها ئەوەم لێ نە پرسیوە چی خەڵکی مەدینە لەو شارە دەردەکات.

لێرەدا "حذیفە" دەڵێت رسول الله هەموو شتێکی پێوتووە تەنیا یەک شت نەبێت. کەواتە ئەم هەموو فەرموودە شاراوانە بۆ کوێ چوون. ئایا دەکرێت بڵێین کە ئەم هاوەڵە بەڕێزە شاردوویەتەوە؟!! حاشا لە مەقامی هەرگیز ناکرێت، بۆیە ئەوەی ئەم عالمە ڕوایەتی کردووە زۆر بەوردی بەتایبەتی لەم کتابی (فتن)ە هێناویەتی، تەنانەت ناو و ساڵەکەشی. بۆیە تۆزێک لەلای زۆربەی بە ناڕاست دادەنرێت. بەڵام دەبێت بشزانین کە هەمووشتێک وتراوە لەبارەی فیتنەوە، باشە ئەگەر وانەبێت ئەی کوا؟

هەروەها یەکێک لەو بابەتانەی کە زۆر گرنگە و مژدەی هاتنیمان پێدراوە ئەویش "مەهدی"یە کە زۆربەی ڕیوایەتەکانی ئەم عالمە کردووەیەتی زۆربەیان بە لاواز (ضعیف) دانراون. من وەکو ڕەئی خۆم هەرگیز ناڵێم واقیع حدیثی (ضعیف) ڕاست (تصحیح) دەکاتەوە. بەڵام واقعەکەی ڕوویدا کە ئەمەش دەبێتە پێشهات وەک یەکێک لە نیشانە ئەژمار دەکرێت. پێموایە ئەم عالمە وەکو چاو ڕووناکی وایە بۆ دۆزینەوەی فیتنەی (تموج کموج البحر) واتە ئەو فیتنانەی وەکو شەپۆلی دەریا وان زۆر بەکەمی خەڵک لێی دەرباز دەبێت.

## زنجیرەی نۆیەم: سیفەتە ڕەوشتی (خولقی) یەکانی مەهدی و حاڵی لە دەست دەسەڵاتدارانی سەردەمەکەی.

لەم بەشەدا باسی دووخاڵ یان دوو لایەنی "مەهدی" دەکەین:

**یەکەم:** ئایا ئیمام "مەهدی" کەسێکی چۆنە لە ئەخلاق و ڕەوشت و زانست (علم) دا؟

**دووەم:** ئایا حاڵی لە دەست دەسەڵاداران چۆنە، یاخود بێخەم و خەیاڵ لێی پاڵکەوتووە؟

### یەکەم: لە ڕووی ئەخلاق و ڕەوشتەوە.

بۆ زیاتر ڕوونبوونەوە، بێگومان ناکرێت کەسێک کە ببێتە خەلیفەی کۆتایی ئیمانداران و یەکێک کە لەلایەن رسول الله وە ﷺ مژدەی هاتنیمان پێ درابێت کەسێکی بێ عیلم و خراپ بێت، هەروەک باقی پێشەوا و نێرداوان کە لەوپەڕی ئەخلاق و ڕەوشت بەرزیدا بوونە. لە ڕیوایەتێکدا کە لە (فتن نعیم بن حماد)دا هاتووە کە دەڵێت: "مەهدی" لە ئەخلاق و ڕەوشت بە گشتی لە رسول الله دەچێت بەڵام لە شکڵ و شێوەدا لە ئەو ناچێت.

کەواتە یەکێک لە ئەخلاق لە (سيد الولد)ی ئادەم بچێت کە الله تعالى لە بارەیەوە دەڵێت: ﴿وإنك لعلى خلق عظيم﴾[1] کە ئەوپەڕی ئەخلاق و ڕەوشتە لە مرۆڤەکاندا. بێگوومان کەواتە ئیمام "مەهدی" لە ئەوپەڕی ئەخلاق دایە، والله أعلم. لەڕووی عیلمیشەوە هەر بەوشێوەیەیە.

هەروەک لەم ڕیوایەتەدا زیاتر بۆمان ڕووندەبێت:

---

[1] سورة القلم: الآية (٤)

حَدَّثَنَا أَبُو يُوسُفَ، عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بَشِيرٍ، عَنْ كَعْبٍ، قَالَ: الْمَهْدِيُّ خَاشِعٌ لِلَّهِ كَخُشُوعِ النَّسْرِ يَنْشُرُ جَنَاحَيْهِ[1].

**دووەم: حاڵی لە دەست دەستەڵاتدارانی ئەو کاتە چۆنە واتە بەر لە دەرکەوتنی؟**

بێگومان ئەمە حاڵی هەموو خاوەن حەقێکی حەقیقییە کە لەلایەن زاڵمانەوە هەوڵی ئەشکەنجە و لەناوبردنیان دەدرێت. کەواتە حاڵی ئیمام هەر بەوجۆرەیە.

لە ڕوایەتێک لە (فتن نعیم بن حماد)دا کە لە چەند ڕیوایەتێکەوە هاتووە، بەڵام کۆکراوەکەی هەموویان بەمشێوەیەیە، کەوا "مەهدی" لەلایەن دەستەڵاتدارانی سعوودیەوە هەوڵی گرتن و لەناوبردنی دەدەن بە هەموو شێوەیەک. ئیمام خۆی و هاوڕێیەکی هەڵدێن، دواتر هاوڕێکەی دەگیرێت و دەکوژرێت و مهدیش ڕزگاری دەبێت و پەنادەباتە بەر بەرزاییەکانی "مەدینە"وە و لەم حاڵەتەدایە (خائفا يترقب)، بەردەوام تاکو کاتی دەرکەوتنی. بێگومان لە ئەوپەڕی ناخۆشییە ئەم حاڵەتە.

هەروەها لەیەکێک لە ڕیوایەتەکاندا هاتووە کە دەڵێت لەلایەن دەسەڵادارانی سعودیاوە هەڵدەستن بە گرتنی پیر و گەنج و منداڵی بچووکی. واتە بنەماڵەکەی تەنانەت منداڵی شیرە خۆرەشی دەگرن، عليهم للعنه الله تعالى. ئەوە بزانە زاڵم واتە بێویژدان لەپێناو مانەوە هەموو ڕێگایەک دەگرێتەبەر. پاشان ئەمەش بە هاوکاری عالمە درۆزن و دین فرۆشەکان دەکات، چونکە ئەم گێلە زاڵم و ستەمکارانە ئەم شارەزاییانەیان نییە.

**ڕوونکردنەوە:** ئەوانەی کە ئاگاداری بارودۆخەکەن و شارەزان دەزانن کە لە ئێستادا سعوودیە بە هاوکاری جوولەکە لە هەوڵی گرتن و لەناوبردنی هەرکەسێکدان کە

---

١ رواه نعيم بن حماد : كتاب الفتن (١٠٦١)

گوومانی لێبکەن، واتە سیفەتی "مەهدی" تێدابێت. چونکە جوولەکە ﴿یعرفون کما یعرفون أبناءهم﴾[1]

**پووختە:**

خاڵێکی گرنگ لەبارەی مەهدییەوە ئەویش ئەوەیە کە جیایە لەزۆربەی پێشەوایانی تری پێش خۆی، چونکە ئێمە لە چەندین فەرموودەی ڕاست و دروستەوە بۆمان ڕوونکراوەتەوە کە ئیمام مەهدی دەسەڵات دەگرێتە دەست و حوکمی تەواوی زەوی دەکات. واتە سەرکەوتنی براوەتەوە کە ئەمەش وەکو مژدەیەکە و پەیامێکیشە بۆ هەموو دەسەڵاتداران کە ناتوانن ڕێگری بکەن لەم سەرکەوتنە. بۆیە ئەمە با ببێتە یەقین بۆ ئیمانداران و دڵنیابن.

<u>**ئەمەش فەرموودەکانی خاڵی دووەمە:**</u>

حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، قَالَ: أَخْبَرَنِي شَيْخٌ، عَنْ جَابِرٍ، عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ، قَالَ: «فَيَبْلُغُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ فَيَخْرُجُ الْجَيْشُ إِلَيْهِمْ، فَيَهْرُبُ مِنْهَا مَنْ كَانَ مِنْ آلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى مَكَّةَ، يَحْمِلُ الشَّدِيدُ الضَّعِيفَ، وَالْكَبِيرُ الصَّغِيرَ، فَيُدْرِكُونَ نَفْسًا مِنْ آلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَذْبَحُونَهُ عِنْدَ أَحْجَارِ الزَّيْتِ[2].

عَنْ أَبِي قَبِيلٍ، عَنْ أَبِي رُومَانَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: يَبْعَثُ بِجَيْشٍ إِلَى الْمَدِينَةِ فَيَأْخُذُونَ مَنْ قَدَرُوا عَلَيْهِ مِنْ آلِ مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَيُقْتَلُ مِنْ بَنِي هَاشِمٍ رِجَالٌ وَنِسَاءٌ، فَعِنْدَ

---

١ سورة البقرة: الآية (١٤٦) سورة الأنعام: الآية (٢٠)

٢ رواه نعيم بن حماد: كتاب الفتن (٩٢٩)

ذَلِكَ يَهْرُبُ الْمَهْدِيُّ وَالْمُبَيَّضُ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَيَبْعَثُ فِي طَلَبِهِمَا، وَقَدْ لَحِقَا بِحَرَمِ اللَّهِ وَأَمْنِهِ.

ثم يبعث إلى رجلين منهم فيقتل أحدهما، والآخر ينظر، ثم يرجع إلى أصحابه فيخرجون حتى ينزلوا جبال من جبال الطائف، بن خالد، عن أبي إسحاق، قال: قال علي رضي الله عنه، ونظر إلى ابنه الحسن، فقال: إن ابني هذا سيد كما سماه النبي ﷺ، وسيخرج من صلبه رجل يسمى باسم نبيكم، يشبهه في الخلق، ولا يشبهه في الخلق. ثم ذكر قصة، يملأ الأرض عدلا.

## زنجیرەی دەیەم: مەهدی لەنێوان سوننە و شیعەدا.

لەم بەشەدا دەمەوێت باسی حەقیقەتی (مهدی منتظر)ی "شیعە" لەگەڵ ئەهلی سوننە و جماعە بکەم!

بێگومان ئەم بابەتە واتە مەهدی چۆن لای ئەهلی سوننەوە گرنگییەکی زۆری هەیە، بەهەمان شێوەش لای شیعەی (رافیزە)ش گرنگییەکی تایبەتی پێدراوە. بەڵام جیاواز لە ئێمە، چوونکە بەدڵی خۆیان دایان تاشیووە و چیان ویستووە بۆیان داناوە و بۆیان زیادکردووە. دەتوانین بڵێین "مەهدی" لەنێوان وەهم و حەقیقەتدایە. لەبەرئەوە زیاتر لە دەوری ئەم بابەتە دەخولێینەوە، چونکە مەهدی لە فیترەتی والعیاذ باللە حاشا لە مقام و لەو زێدەڕەوییە خوای ئەوانە! چونکە ئیمامی "علی"یان پێ خوایە! هەروەک خۆم زۆرجار بیستوومە لێیان لەجیاتی (یا اللە) "یاعلی" دەڵێن. ئنجا پێشیان پێغەمبەرە! هەروەها ئیمامی "حسن" و "حسێن"یش، زیاتر ئیمامی "حسێن".

بێگومان ئێمەی ئیماندار هەریەکەیان هەروەک چۆن پلەو پایەیان لە ئیسلام دیاریکراوە بەوشێوەیە سەیریان دەکەین، نە زیادەڕەوی دەکەین نە بەکەم سەیریان دەکەین.

**یەکەم: لەبارەی (نەسب)ی ئیمام "حسن" و "حسێن" ڕەزا و ڕەحمەتی الله یان لێبێت.**

بێگومان هەردوو ئیمامەکە، زۆر ڕێزدارن (سبط رسول الله ﷺ وريحانتين). هەروەها ئێمەش ئاوا سەیریان دەکەین. من خۆم ئەوەندەی کە سەیری سەرچاوەکانی ئەم بابەتەم کرد، واتە لە لایەنی (سنن)یەکەوە زۆربەی نوسەر و زانا بەڕێزەکان دەیگێڕنەوە بۆ ئیمام "حسن" واتە لە نەوەکانی ئەمە. بەڵام لایەنە شیعیەکان دەیگێڕنەوە بۆ ئیمام "حسێن". هەربۆیە لە کتێبی (مهدی وقرب ظهوری)دا هاتووە دەڵێت: واباشترە لە باوکەوە بیگەڕێنەوە بۆ ئیمام "حسن" و لە دایک بۆ "حسێن" کە خۆم لەگەڵ ئەم ڕایەم، چونکە زۆربەی (سەلەف) لەگەڵیدان.

**دووەم: لەبارەی دەرچوونیەتی، لەکوێوە دەردەچێت؟**

بێگومان ئەمەشیان ئیختیلافاتی لەسەرە. هەر لەبەرئەوە دیاری نەکراوە کە دەرچوونی لە جیهادەوەیە یان لە سەرکەوتنەوەیە. هەروەها دیسانەوە هەردوولا، هەم (شیعە) و هەم (سوننە) موتەفق و کۆکن لەبارەی شوێنی دەرچوونیەوەکە لە (من قبل المشرق)ەوەیە. بەڵام دوو ڕوانگەی جیا و لێک دوورن؟چۆن؟

لەڕوانگەی ئەهلی جەماعەدا (من شرق مدينه) یان (مەککە) دەرەچێت کە ئەمەش موعتەبر و ڕاسترە چونکە یەک دەگرێتەوە لەگەڵ فەرموودەی (رايات السود) کە دەڵێت:

(من قبل المشرق). لێرەدا ئیمام "إبن كثیر" له (البدایه والنهایه)دا دەڵێت: واته (شرقی مدینه).

ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمُ ابْنُ خَلِيفَةٍ. ثُمَّ لَا يَصِيرُ إِلَى وَاحِدٍ مِنْهُمْ، ثُمَّ تَطْلُعُ الرَّايَاتُ السُّودُ، مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ، فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قَوْمٌ. ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا لَا أَحْفَظُهُ، فَقَالَ: فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ، وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الثَّلْجِ، فَإِنَّهُ خَلِيفَةُ اللَّهِ الْمَهْدِيُّ.

تَفَرَّدَ بِهِ ابْنُ مَاجَهْ، وَإِسْنَادُهُ قَوِيٌّ صَحِيحٌ، وَالظَّاهِرُ أَنَّ الْمُرَادَ بِهَذَا الْكَنْزِ الْمَذْكُورِ كَنْزُ الْكَعْبَةِ، يَقْتَتِلُونَ عِنْدَهُ; لِيَأْخُذَهُ ثَلَاثَةٌ مِنْ أَوْلَادِ الْخُلَفَاءِ، حَتَّى إِذَا كَانَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ خَرَجَ الْمَهْدِيُّ مِنْ بِلَادِ الْمَشْرِقِ، وَقِيلَ: مِنْ مَكَّةَ.

بەڵام لەڕوانگەی وەهم و ڕەفزی و (ڕافیزە)ییەوە دەڵێن واته (من قبل املشرق)، بەڵام مەبەستیان (سرداب سامرا) كه دەڵێن "علی عسكری"، واته مەهدی ئەوان لەوێوە دەرەچێت.

مِنْ سِرْدَابِ سَامَرَّا، كَمَا تَزْعُمُهُ الرَّافِضَةُ مِنْ أَنَّهُ مَحْبُوسٌ فِيهِ الْآنَ، وَهُمْ يَنْتَظِرُونَ خُرُوجَهُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ، وَهَذَا مِنَ الْهَذَيَانِ، وَقِسْطٌ كَبِيرٌ مِنَ الْخِذْلَانِ، وَهَوَسٌ شَدِيدٌ مِنَ الشَّيْطَانِ. إِذْ لَا دَلِيلَ عَلَى ذَلِكَ وَلَا بُرْهَانَ، مِنْ كِتَابٍ وَلَا سُنَّةٍ وَلَا مَعْقُولٍ صَحِيحٍ وَلَا بَيَانٍ[١].

**دەرئەنجام:**

لێرەدا مەبەستەكە ئەمەیە كە (ڕافیزە) پێیوایە كە مەهدی چاوەڕوانكراو "علی عسكری"یە كە پێیانوایە لەناو (سردابی سامڕائە)وە زیاتر لە پێنج سەد ساڵە چاوەڕێین!

---

١ إبن كثیر: كتاب البدایه والنهایه.

هەروەها چەندین وەهم و خەیاڵیان بۆخۆیان دروستکردووە، بەڵام مەهدی حەقیقی لە نەوەی ئیمام "حسن"ە،ناوی "محمد عبدالله"یە لە (شرق مکە) یان (مدینە) دەردەچێت.

## زنجیرەی یانزەیەم: پێش دەرچوونی چی هەیە یان حاڵی دونیا و خەڵك چۆنە؟

ئەم بەشە یەكێكە لە هەرە بەشە گرنگەكان لەم بابەتە بۆ ئیمانداران، لەبەرئەوەی هۆكارێكە بۆ زیاتر ڕوونتربوونی دەركەوتنی ئەم حەققە. بێگومان لەم بەشەدا بۆمان دیاریكراوە بە نەصی (حدیث صحیح و صریح) كە لە چی كات و سەردەمێكدا دەردەكەوێت. بۆ ئەم مەبەستەش ئەم دوو فەرموودە ڕاست و دروستە دەكەین بە پێوەری دیاریكردنی كاتەكەی، بەڵام ساڵ نا.

**فەرموودەی یەكەم:**

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (أُبَشِّرُكُمْ بِالْمَهْدِيِّ يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ وَزَلَازِلَ، فَيَمْلَأُ الْأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلًا، كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا وَظُلْمًا، يَرْضَى عَنْهُ سَاكِنُ السَّمَاءِ وَسَاكِنُ الْأَرْضِ).

**فەرموودەی دووەم:**

ثوبان رضي الله عنه، أن النبي ﷺ قال: (يَقْتَتِلُ عِنْدَ كَنْزِكُمْ ثَلَاثَةٌ، كُلُّهُمْ ابْنُ خَلِيفَةٍ، ثُمَّ لَا يَصِيرُ إِلَى وَاحِدٍ مِنْهُمْ، ثُمَّ تَطْلُعُ الرَّايَاتُ السُّودُ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ فَيَقْتُلُونَكُمْ قَتْلًا لَمْ يُقْتَلْهُ قَوْمٌ، ثُمَّ ذَكَرَ شَيْئًا لَا أَحْفَظُهُ. فَقَالَ: فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَبَايِعُوهُ وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الثَّلْجِ، فَإِنَّهُ خَلِيفَةُ اللَّهِ الْمَهْدِيُّ).

**بەشی یەکەمی فەرموودەکە:** [يُبْعَثُ فِي أُمَّتِي عَلَى اخْتِلَافٍ مِنَ النَّاسِ...]

واتە دەردەچێت یان دەردەکەوێت لەناو ئوممەتەکەم لەکاتێکدا کە ناکۆکی هەیە لەنێوان خەڵکیدا...

لێرەدا دەتوانین بیگەڕێنینەوە بۆ ئەم هەموو تەفرەقە و فیرقەی کە هەیە لەنێوان ئیسلام هەروەک لە فەرموودەی ڕاستی ئیختیلافی ئوممەت لەسەر (٧٢) تیرەی جیاواز، والله أعلم. ئنجا دەتوانین بۆ دیوە دنیاوی و سیاسیەکەش بیگەڕێنینەوە و کە بەشێوەیەکی گشتی ناکۆکی نێوان دەوڵەتانە، والله أعلم.

**بەشی دووەمی فەرموودەکە:** [زلازل]

واتە بوومەلەرزە، بەڵام بەلەفزی "زۆر" واتە زۆربوونی ڕوودانی بوومەلەرزە، کە ئەمەش گشتییە واتە ڕوودانی بومەلەرزە لەهەموو زەوی بەشێوەیەکی زۆر. واتە مەرجە بۆ دەرکەوتنی کاتی مەهدی ئەو کاتە بومەلەرزە زۆر ڕووبدات و ڕوویدابێت جیاواز لە هەموو کاتێکی تر.

**بەشی سێیەمی فەرموودەکە:** [اختالف]

واتە ناکۆکی، ناکۆکی سێ کوڕ کە هەرسێکیان شازادەن و ناکۆکیەکەش لەسەر (کەنز)ە. ئنجا ئەم کەنزەش دیاری نەکراوە کە چییە. بەڵام بەشێکیان دەڵێن کەنزی (کەعبە)یە، بەشێکی تریان دەڵێن نەوتە و هیچیان هەڵەنین، والله أعلم.

**بەشی چوارەمی فەرموودەکە:** [ظلما وجورا]

واتە زۆڵم و ستەم زۆر دەبێت بەتایبەت دەتوانین بۆ ئەوە بیگەڕێنینەوە کە زیاتر موسڵمان لێرەدا زۆڵمی لێدەکرێت لە هەموو لایەک ئازار دەدرێت و ئەشکنجە دەدرێت و دەردەکرێت دەکوژرێت و هەتک دەکرێت. بۆیە دەتوانین بەشێوەی گشتی بیگەڕێنینەوە کە زوڵم و ستەم زۆردەبێت و ئەم زوڵمە لەلایەن مەهدییەوە دەبڕێتەوە (قسطا وعدلا). ئەمیش بەهۆی جێبەجێکردنی حوکمی قورئان لەسەر هەموو زەوی.

**دەرئەنجام:** ئەمانە مەرجن بۆ هاتنەدی ئامانجەکە کە ئەمیش "مەهدی"یە.

**ڕوونکردنەوە:**

لە ئێستادا ئەوانەی کە چاودێری بارودۆخەکە دەکەن دەزانن کە زۆربەی نیشانە بچووکەکان ڕوویانداوە و هاتوونەدی چەند نیشانەیەکی کەم نەبێت. لە ئێستادا بۆ ماوەی ٢ ساڵە هیچ کاتێک وەکو ئێستا بوومەلەرزە زۆر نەبووە و ڕوونەداوە. هەروەها ناکۆکی و دووبەرکی هەم بەشێوەیەکی گشتی هەم تایبەتی زۆر زۆربووە لەنێوان خەڵک. ئنجا لە ئێستادا موسڵمانان لەهەموو لایەکەوە زوڵمیان لێدەکرێت و دەچەوسێنرێنەوە هەموو چاویان لە گەڕانەوەی عیزەتە، والله أعلم.

لەئێستادا بەپێی ئەوەی زۆربەی واقع و فەرموودەکان لەگەڵ یەکتردا یەکدەگرێتەوە دەتوانین بڵێین زۆر زۆر نزیکین لە کاتی دەرکەوتنی یان لە ئێستادا ئێمە لەکاتی دەرکەوتنی داین. بۆیە وریابن و خۆتان بۆ گۆڕانکارییەکان ئامادەبکەن.

## زنجیرەی دوانزەیەم: ناوی ڕاستەقینەی مەهدی.

ئایا دەکرێت ئیمامی "مەهدی" ناوێکی دیکەی هەبێت جگە لە ناوی محمد بن عبدالله؟!

واتە زۆر کەس دەپرسێت، ئایادەکرێت ناوێکی تری هەبێت. لەهەموو بابەتێکی دینیدا ئێمە مولزەمین بگەڕێینەوە بۆ نەقڵ، چونکە دین نەقڵە و نەقڵیش بە تێگەیشتنی (سلف)ی ئوممەت نەک (خلف) بێت.

عن عبدالله بن مسعود عن النبي ﷺ: (لو لم يبق من الدنيا إلا يوم لطول الله ذلك اليوم حتى يبعث رجال مني أو من أهل بيتي يواطىء اسمه اسمي و اسم أبيه اسم أبي، يملأ الأرض قسطا وعدلا كما ملئت ظلما وجورا)[1].

ئەو فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مەهدی ناوی (محمد بن عبدالله)یە. با بزانین زانایان چۆن باسی وشەی (يواطىء) دەکەن کە کێشەکە لێرەیە هەندێک دەڵێن دەکرێت ناوی دیکەی هەبێت جگە لە (محمد بن عبدالله).

**یەکەم:** "ابن تيميه" دەڵێت: اخبر النبي صلى الله عليه وسلم ان اسمه (محمد بن عبدالله)[2]. هەروەها دەڵێت: المهدي الذي اخبر به النبي صلى الله عليه وسلم اسمه (محمد بن عبدالله)[3]. دەڵێت پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە کە ناوی مەهدی (محمد بن عبدالله)یە.

**دووەم:** "ابن كثير" دەڵێت: ناوی (محمد بن عبدالله العلوي الفاطمي الحسني)[4]یە.

---

١ رواه أبو داود والترمذي. وقال: حديث حسن صحيح.

٢ المسائل جامع ٣/ ١٩

٣ منهاج السنة ٤/ ٩٥

٤ البداية والنهاية ج١٩ /ص٦٢

**سێیەم:** شێخ "مال قاری" دەڵێت: (یواطئ اسمه اسمي و اسم ابیه اسم ابي)[1].
دەڵێت: ناوەکەی (محمد بن عبدالله)یە ئەمەش وەکو ڕەددانەوەیە کە بۆ شیعە.

**چوارەم:** هەروەها "قاضی عیاض"یش وا دەڵێت لە کتابی (الشفا)[2]دا.

## لەبەرچی مەهدی دەبێت ناوی "محمد بن عبدالله" بێت؟

لەبەرئەوەی ناوی "محمد" ناسراوترین ناوەکانی پێغەمبەرە ﷺ لە شایەتومان، لەکاتی بانگدان، لەکاتی سەڵاوات و زۆر لە شەعائیرەکانی تریش. تەنانەت لە قورئانیش ٤ جار ناوی هاتووە. هەروەها کاتێک باسی ناوی باوکی دەکرێت (اسم ابیه اسم ابي)، یەکسەر بیرو هزرمان بۆ ناوی باوکی پێغەمبەر ﷺ دەچێت کە ناوی "عبدالله"یە، نەوەک ناوێکی تر کە پێویستی بە (قەرینە)یەکە بۆ ڕوونکردنەوەی. "ابن حجر" دەڵێت: لەنێوان "احمد" و "محمد" دیارترینیان (محمد)ە[3]. لە قورئانیش دووبارەبووەتەوە، تەنها لە باسی "عیسی"دا ناوی بە "احمد"هاتووە.

پێغەمبەر ﷺ ناوەکەی بۆ ئێمە دیاریکردووە تاکو بیناسین و لێمان تێکەڵ نەبێت. بەڵام ناوەکانی (الماحی، الحاشر، العاقب) هەرچەندە یەکێکن لە ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام بەموتڵەق نین دەبێت (قەرینە)یەک لەگەڵیدا هەبێت تا ماناکەی ڕوونبکاتەوە. بۆیە ناوی "احمد و محمد" بە موتڵەق هاتوون، بەڵام کاتێک دەفەرموویت: (أنا الماحي)، لەدوایدا

---

١ مرقاة المفاتيح ٨/ ٣٤٣٩ _ عون المعبود ١١/ ٢٥٠
٢ الشفا ٢/ ٤٧٠-٤٧١
٣ فتح الباري ٦/ ٥٥٥

دەفەرمووێت: (الذي يمحى بي الكفر) يان (انا الحاشر)، لەدوایدا دەفەرمووێت (الذي يحشر الناس على عقبي)[1].

**دەرئەنجام:**

بەپێی وتەی ئەو زانایانەی سەرەوە، وشەی (يواطیء) هاوشێوە نییە لەگەڵ ناوەکەی، بەڵکو هەمان ناوە واتا "محمد بن عبدالله". هەروەکو ئەوە بۆچوونی شێخ "سليمان ناصر العلوان"یشە کە دەڵێت: مەهدی ناوی "محمد بن عبدالله"یە.

بۆیە ئێمەی موسلمان زانایانمان هەیە شتەکانیان بۆ ڕوونکردوینەوە، هیچ عوزێکیان نەهێشتووەتەوە بۆئەوەی گومانمان نەبێت لە ناوەکەی. کەواتە ناکرێت مەهدی هیچ ناوێکی تری هەبێت جگە لە "محمد بن عبدالله"، هەروەکو شیعەکان ناوی باوکی حەزف دەکەن و لایدەبەن هەتا یەکبگریتەوە لەگەل مەهدی گوماناوییەکەی خۆیان. کەواتە بەپێی تێگەیشتنی سەلەف شتەکان وەردەگرین!

## زنجیرەی سیانزیەم: چۆن دەبێتە فەرمانڕەوایی هەموو زەوی؟ (يصلحه الله في ليلة).

بۆئەوەی زیاتر لاتان ڕوون بێت و باشتر و ئاسانتر لێی تێبگەن دەگەڕێینەوە بۆ قورئان. لە قورئاندا دوو نمونەمان بۆ باسکراوە کە نموونەی موسڵمانانە، واتە دوو نموونە کە حوکمی هەموو زەویان کردووە لە خۆرهەڵات تاکو خۆرئاوا:

---

[1] زاد المعاد ١/ ٨٤

**یەکەم:** ذی القرنین

**دووەم:** "سلیمان" علیه سلام

**یەکەم: ذی القرنین.**

قال تعالی في سوره الکهف: پرسیاریان کرد دەربارەی ذوالقرنین..

﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا ۝ فَأَتْبَعَ سَبَبًا﴾[1]

لێرەدا نامەوێت بچمە ناو تەفاصیلی و درێژی بە کورتی الله تعالی لێرەدا لە باسی "ذی القرنین"دا دەڵێت: ﴿أتیناه من کل شيء سببا﴾ هۆکارێکی کە الله پێی داوە بۆ ئاسانکاری و گواستنەوەی لە هەموو زەوی و حوکم کردن لە زەوی. واتە لە ماوەیەکی کورتدا (مشارق ومغارب)ی زەوی کردووە. ئنجا حوکمی الله لێ چەسپاندووە، هەربۆیەش الله زیاتر ئاسانکاری بۆ کردووە. ئەمەش یارمەتی الله یە بۆ بەندە ئیماندارەکانی.

﴿ثم أتبع سببا﴾ کەواتە ئەگەر ئەم هۆکارەی الله تعالی نەبووایە ئەوا نەیدەتوانی حوکمی هەموو زەوی بکات. هەربۆیە الله ئامادەیکردووە بۆ ئەم کارە، هەم ئامادەکردنی جەسدی و هەم عیلمی.

**دووەم: سلیمان علیه السلام.**

لێرەدا ئەم پێغەمبەرە حوکمی هەموو زەوی کردووە لە خۆرهەڵات تاکو خۆرئاوا، بەڵام چۆن؟ ئایا الله تعالی چۆن ئامادەی کردووە؟

---

[1] سورة الکهف: الآية (٨٥-٨٤)

قال تعالى: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا ۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ ۝ وَمِنَ الشَّيَاطِينِ مَنْ يَغُوصُونَ لَهُ وَيَعْمَلُونَ عَمَلًا دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَكُنَّا لَهُمْ حَافِظِينَ﴾[1]

دیسانەوە بەکورتی الله ئامادەی کرد لەڕێی ئەم هۆکارانە. لێرەدا الله تعالى ئەم کەسە کە پێغەمبەرە کە ئەمیش "سلیمان" ئامادەی دەکات بۆ ئەوەی کە حوکمی الله تعالى لەسەر هەموو زەوی جێبەجێبکات. بێگومان الله لەڕێی (مسخر)کردن و سازاندنی (الریح) و (جن) کە ئەمانە ئەوپەڕی دەستەڵاتن و ئامراز و هۆکاری جێبەجێکردنی ئەم حوکمەن. دواتر الله تعالى بۆ زیاتر ئامادەکاری عیلمیشی بۆ دەکاتن هەروەک، قال الله تعالى: ﴿فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ ۚ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ﴾[2]

کەواتە الله (فەهمی) پێبەخشی واتە (هێز و علم)، بەڵێ ئەمەش نموونەی ئامادەکاری بوو لەلایەن الله تعالى بۆ کەسێک کە حوکمی هەموو زەوی بکات. لێرەدا بۆ زیاتر ڕوونتر بوون و هەروەها بۆ تێگەیشتنان بەشێوەیەکی پووخت کۆتا نموونە ئەمیش پێغەمبەری ئاخر زەمان (خاتم الأنبياء) دەهێنینەوە، لەبەرئەوەی تایبەمەندی ئەوەبوو کە (للعاملین)، واتە جن و ئینس بۆ هەردووکیان بوو، الله تعالى ئامادەی کرد.

**یەکەم: لەلایەنی (جسدی).**

الله تعالى قوەت و هێز و غیرەت و ئازایەتی سی پیاوی پێ بەخشی.

---

١ [سورەتی الأنبياء: الآية ٨٢-٨١]

٢ [سورەتی الأنبياء: الآية ٧٩]

**دووەم: لەلایەنی (علمی و حکیمی).**

دووجار زگیان شەقکردووە، هەم ئیمان و هەمیش حیکمەتیان بۆ زیادکردووە و پاکیان کردووەتەوە لەشی لە بەشی (شیطان).

**سێیەم: لە (قائد لارض) "مەهدی"یە**، وەک لەم فەرموودە واتە بۆئەوەی زیاتر لە مانای ئەم ووشەیە تێبگەن.

(المهدي منا أهل البيت يصلحه الله في ليلة) واتە مەهدی لە ئالوبەیتی منە خوای گەورە پلە و شکۆی لە یەک شەودا بەرز دەکاتەوە.

(إصلاح) هەریەکە و بەجورێک لێکیدەداتەوە، لەڕاستیدا ئەم ئەمیرە واتە خەلیفەی ئاخر زەمان کە مەهدییە، وەک بۆ هەموو لایەک ڕوونە کە الله تعالی دەسەڵاتی هەموو زەوی دەداتە دەست تاکو حوکمی الله تعالی جێبەجێ بکات. لەداهاتوودا باسی دەکەم بەڵام لێرەدا هەروەک نموونەکانی "ذو القرنين" و "سلیمان" علیه السلام و رسول الله ﷺ ئامادەکردنەکە هەم (جسدی)یە و هەمیش (عیلمی)یە والله أعلم، واتە مادی و مەعنەوییە. لەبەرئەوەی لە ماوەیەکی زۆر کورت حوکمی زەوی دەگرێتەوە دەست، دەیکات بە (قسطا وعدلا) هەروەک چۆن بوو بە (ظلما وجورا).

## زنجیرەی چواردەیەم: (بیعە المهدی) بیعەتی حەقیقی و (عائذی یەکەم) و (عائذی دووەم).

یەکێکە لە بەشە زۆرگرنگ و تایبەتەکان. بێگومان ئەم بەشە زۆر گرنگە بۆ ئیمانداران بۆ دڵنیابوونی تەواوی لەبارەی ئەم کەسایەتییە، کە ئیمام مەهدی بەتایبەتی دوای تەواوبوون و ڕوودانی (عائذی یەکەم)، ئەم بەشە لەبەرئەوە گرنگە تەنیا بە بەشێک تەواو نابێت واتە بۆئەوەی زیاتر لاتان ڕوون و ئاسانتربێت، بۆیە بەوردی و پووختی باسی دەکەین، بإذن الله.

لەسەرەتادا ماشاء الله نوسین و کۆکردنەوەی بابەتێکی دینی، بەتایبەت مەهدی بەڕاستی دەیەوێت ئەمە واتای ئەوە نییە کە سەرچاوە نەبێت. نەخێر، بەڵکو سەرچاوە زۆرن بەڵام هەڵبژاردنی پوختەکەی، هەروەها دیاریکردنی پلەبەندی لە فەرموودەکاندا، سەرباری وردی و غەیبیاتی. داواکارم لە الله لێمان خۆشبێت.

دوو فەرموودەمان هەیە بۆ دیاریکردنی بیعەی ئەصڵی واتە مهدی حەقیقی.

**فەرموودەی یەکەم:**

عن أبي هريرة عن النبي ﷺ قال: (يبايع الرجل ما بين الركن والمقام ولن يستحل البيت إلا أهله فإذا استحلوه، فلا تسأل عن هلكة العرب ثم تجئ الحبشة فيخربونه خرابا لا يعمر بعده أبدا هم الذين كنزه)[1].

ئایا ئەم فەرموودەیە لەسەر "مەهدی" حەقیقییە یان نا؟

---

[1] رواه احمد وابن حبان وإسناده صحيح.

پێویستە بگەڕێینەوە بۆ قۆناغێک پێش ئێستا بۆ دیاریکردن و زانین کە لە ساڵی ١٩٧٩ دا لە حەرەمی "مەککە"دا بەیعەتدرا بە پیاوێک ئەویش "محمد بن عبدالله القحطانی" و بە پشتیوانی "جهیمان العتیبی" هۆکارەکەش ئەم پیاوە لە خەویدا بینیبووی کە مەهدی چاوەڕوانکراوی (جزیرة العرب) لەسەردەستی ئەم ڕزگار دەکرێت. بەڵێ، لێرەدا هەردووکیان کەسانی خراپ نەبوون و قووتابی "إبن باز"بوون. لەبەرئەوەی هەندێ سیفەتی لە مەهدی دەچوو وەکو (أجلی الجبهه وأقنی لانف). هەروەها لەگەڵ زیاتر لە ٢٠٠ پیاو کە بیعەتیان پێدابوو چوونە ناو (حەرەم) و کۆنترۆڵیان کرد کە چەک و زەخائیری لاوەکی و سووکیان پێبوو. بەڵام لەماوەیەکی زووگرتیانەوە محمد و جهیمان و خەڵکێکی زۆری ناو حەرەم کوژران، ئەمە بەکورتی.

با بزانین چی تێبینییەک لەم فەرموودەدا هەیە.

**بەشی یەکەمی فەرموودەکە:** [يبايع الرجل مابين الركن والمقام]:

دەبێت وردبین چونکە بەیعەتی "مەهدی" حەقیقی ئەمیش لەنێوان ڕوکن ومقامە، بەڵام جیاوازی ئەمەیان (إكراه)ە، واتە خۆی داوای بەیعەتی کردووە، بەڵام ئەمیان بە(إكراه)ە، واتە بەزۆرملێ بەیعەتی پێدەدەن.

**بەشی دووەمی فەرموودەکە:** [الرجل]

بێ دیاریکردن و عەلاماتی ناسینەوەی یان ناوی وەک "مەهدی" حەقیقی، ئەمەش دەبێتە ئەسبابی لەیەک جیاکردنەوەیان.

**بەشی سێیەمی فەرموودەکە:** چوونە ناو حەرم بە چەکەوە.

ئەمەش هۆکارێکە بۆ ناسینیەوەی بەیعەتی حەقیقی مەهدی، چونکە ئەمان بێ چەکن. لەکۆتایی ئەم فەرمووده لەسەر بیعەتی "مهدی" حەقیقی نییە، بەڵکو لەسەر ئەم واقیعەی کە ڕوویداوە دەچەسپێت.

**فەرموودەی دووەم یان (أثر):**

جاء في كتاب الفتن: عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ تُبَيْعٍ، قَالَ: "سَيَعُوذُ بِمَكَّةَ عَائِذٌ فَيُقْتَلُ، ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ بُرْهَةً مِنْ دَهْرِهِمْ، ثُمَّ يَعُوذُ آخَرُ، فَإِنْ أَدْرَكْتَهُ فَلا تَغْزُوَنَّهُ، فَإِنَّهُ جَيْشُ الْخَسف".

پێویستە بزانین (عائذی یەکەم) کێ بوو؟ ئنجا ئایا ڕوویداوە؟

**عائذی یەکەم:** [سَيَعُوذُ بِمَكَّةَ عَائِذٌ فَيُقْتَلُ]

هەروەک لای هەمووان ڕوونە کە ڕوویداوە زۆربەی بۆچوونەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە ڕووداوی (جهیمان)[1]. (عائذی یەکەم) بوو. ئنجا ناچمە ناو تەفاسیلی چونکە زۆری لەسەر ووتراوە، بەڵام ئەو گەنجە لەبەرئەوەی لە خەونیدا بینیبووی و کەسێکی ڕاستگۆ بوو، درۆزن نەبوو بە یارمەتی خەزوری خۆی و زیاتر لە ٢٠٠ کەس کۆنترۆڵی حەرەمی "مەککە" دەکەن نزیکەی ١٥ ڕۆژ، بەڵام زوو دەکوژرێت لەلایەن دەسەڵاتی سعوودیەوە بە یارمەتی خوبەرائی فەڕەنسییەوە.

---

١ ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٩٧٩ دا ڕوویدا، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە "جهیمان العتیبی" و هاوەڵەکانی بەیعەتیان بە "محمد عبدالله قحتانی"دا بە محمدی مەهدییان ناساند لەسەر چەند بنەمایەک، بەڵام لە ئەنجامی جوان سەرنج نەدان ورد نەبوونەوەیان لەمەرج و نیشانەکانی بوون بە مەهدی نەیان پێکا.

بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم ڕووداوە، ئەم نوسینە دابگرە

**موددەیەک:** [ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ بُرْهَةً مِنْ دَهْرِهِمْ]

پاشان خەڵکی واتە دوای ڕووداوی "جهیمان" کە لە حەفتاکان بوو خەڵکی بەردەوام دەبن لەسەر ئەم حاڵەیان (برهة من دهرهم) بەکورتی زۆربەی زانایان لێکدانەوەیان بۆ ئەم وشەیە تا ٤٠ ساڵە زۆریەکەی دەگاتە ٤٥ ساڵ، واللە أعلم.

بەپێی لێکدانەوەی سەرجەم بۆچوونەکان ئێستا ئێمە لەکۆتایی (بورهە)کەداین، واللە أعلم. ئەوەی لێرەدا گرنگە و ئەم فەرموودە یان (أثر)ەی بەهێزکردووە ڕوودانی واقعەکەیە، واتە هاتنەدی ئەم واقعەیە. کەواتە ئێستا گریمانەی بۆ دانانێین بەڵکو قسە لەسەر دوای ئەم ڕووداوە دەکەین، واللە أعلم.

**پاشان:** [ثُمَّ يَعُوذُ آخَر]

ئێستا زانیمان (عائذی یەکەم) ڕوویداوە و چاوەڕێی (دووەم)یانین کە واللە تعالی أعلم ئیمام "مەهدی"یە بإذن اللە.

ئەمە کورتەیەکی پووخت بوو بۆ زیاتر ڕوونتربوونی. ئێستا بیرۆکەیەکتان وەرگرت لەسەر (بیعەی حەقیقی) و دواتر دیاریکردنی کاتی (بیعەی مهدی)، بإذن اللە.

## زنجیرەی پانزەیەم: بەیعەتی حەوت عالم بەر لە "مەهدی" !

لەم بەشەدا ئاماژە بە (أثر)ێک دەدەین کە واقعەکەی هاتووەتەدی، ئەویش ئەمەیە:

وعن عبدالله بن مسعود، رضي الله عنه قال: إذا تقطعت التجارات والطرق، وكثرت الفتن، وخرج سبعة علماء من آفاق شتى على غير ميعاد، يبايع لكل رجل منهم ثالثمائة وبضعة عشر رجال[١].

هاتنەدی ئەم واقعە والله تعالى أعلم. دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئێمە گەیشتووینە نزیکترین قۆناغ، بۆ؟ چوونکە بۆئەوەی بیزانن دوای ئەم بیعەتە ڕاستەوخۆ بیعەتی "مەهدی" بەدوادادێت، والله أعلم إن شاء الله.

**لێکدانەوە:**

**یەکەم:** کاتێک کە بازرگانی و هاتوچۆ دەپچڕێت.
**دووەم:** لەگەڵ زۆربوونی فیتنە واتە شەڕ و ناکۆکی.

لەم بارودۆخانەدا ٧ زانای دەردەچن کە هیچ پەیوەندی پێش وەخت و موعیدێکی دیاریکراویان لەنێواندا نییە، بەڵکو قەدری الله بەمشێوە دەبێت.

لەبەر نزیکبوونەوەی کاتی دەرکەوتنی "مەهدی" الله ئەم شتانە ڕێک دەخات. بەیعەت دەدرێت بەهەر یەکێکیان، واتە بەیعەی جیاواز بۆ هەر یەکێکیان ٣١٣ والله اعلم زۆرینە بەم ژمارەیە لێکیدەدەنەوە، هەروەک ژمارەی "طالوت" و "بدر" کە الله خۆی نهێنیەکەی دەزانێت!

١ أخرجه نعيم بن حماد، في كتاب الفتن.

**ئێستا دێینە سەر بەراوردکردنی بە واقع:**

بەڵێ واقعەکەیمان هەیە، لە ساڵی ٢٠١٣ دا لە شاری (عەدەن)[1] کۆمەڵێک زانا کۆبوونەوە، مەشروعێکیان دامەزراند. بۆچی؟

بۆ زیاتر پاڵپشتی لە "مەهدی" لەکاتی دەرکەوتنیدا لە (بلاد الحرمین). ئەوەی گرنگە چی کاتێک بوو؟

ساڵی ٢٠١٣ پێموابێت زۆرینەتان دەزانن کە ئەم کات (جزیرەی عەرەبی) کەوتبووە نێو گێژاوی فیتنەوە، ئنجا پەیوەندی و بازرگانی لەنێوان زۆرینەی وڵاتانی عەرەبی نەمابوو، ئەمەزۆرینەتان دەیزانن. تائێستاش ئەم مەشروعە بەردەوامە و لەچەند وڵاتێکی عەرەبیدا.

ئنجا شێخ "حسن التهامی" حفظ الله تعالى، یەکێک بوو لەوانەی کە بەیعەتیداوە.

بەڵێ، چۆن ئەم واقیعە بەیەک بەراورد دەکەیت؟ ئایا ئەمە شتێکی ئاساییە؟

**وەڵام:** نەخێر، چۆن دەکرێت ئاسایی بێت کە (أثر)ێک بەر لە سەدان ساڵ لەگەڵ واقعێک کە چۆن باسکراوە ئاوا هاتووەتەدی. نەخێر، ئەمە ئاسایی نییە بەڵکو نزیك بوونەوەی وەعدێکی چاوەڕوانکراوە کە "مهدی"یە، والله اعلم.

**واقع و فەرموودە یان (أثر):**

دەڵێت لە کاتی پچڕانی بازرگانی و پەیوەندی نێوان وڵاتان. بەڵێ ئەم مەشرووعە لەم کاتەدا داواکراوە و لەگەڵ فیتنە. بەڵێ، زۆرترین فیتنە کەوتبووە نێو (جزیرة العرب)ەوە. بۆیە بە ناوی الله ئێمەش دەیچەسپێنین لەگەڵ یەکتردا. ئەم بەیعەتە بەردەوام دەبێت

[1] دەکەوێتە باشوری یەمەنەوە لە خوارووی (سەنعا)ی پایتەختەوەیە، لەسەر دەریای عەرەبییە.

تاکو نێوان (الركن والمقام) و زیاتر شەکڵییە و بەیعەتێکی تایبەت و بچووک دەناسرێت، واتە (التزامات) دروست ناکات لە سمع و طاعة تا بەیعەتی ئیمامی الآخر الزمان.

لەکۆتاییدا دەمەوێت پێتان ڕابگەینم ناچمە ناو تەفاسیلی شتەکان هەتاکو کاتی خۆی. بەڵام وریابن ئەمەی دەیڵێم نووکتە و چیرۆکی درۆ و دروستکراو نییە تا بتوانم بۆخۆم بیڵێم و دایبڕێژم ئەمە دینە و عەقیدەیە، درۆکردن تێیدا ماڵ وێرانییە. زیاتر پێویست بەدرێژ کردنەوە ناکات. ئێستا بیرۆکەیەکتان وەرگرت لەسەر ئەم قۆناغە و زانیتان کە واقعێک ڕوویداوە بەڵام تا ئێستا زۆربەتان نەتانزانی بوو، بۆیە ئێستا دەیزانن و حوجەتان نەما.

## زنجیرەی شانزەیەم: بیعەت لەنێوان "ڕوکن" و "مقام"[1]دا.

گرنگە چونکە دەزانیت چی کاتێکە! لەدوای باسکردنی و زانینی قۆناغەکانی پێشوتردا دێینە سەرباسی هەستیارترین و گرنگترین قۆناغ و ڕووداوی مێژوویی کە ئەمیش بیعەت پێدانی (إمام الآخر الزمان مهدی الأمه) علیه السلام. لێرەدا فەرموودەی زۆری لەسەر هاتووە، بۆیە هەوڵدەدەین پووختەی سەرجەمیان بەشێوەیەکی ورد و پوخت بۆتان باسبکەین بإذن الله تعالى. لە سەرەتادا دەبێت بزانین بەر لە "بیعەت" چی ڕوویداوە و ڕوودەدات!

١ ئەو دوو جێگایەن کە لە تەنیشت یەکەوەن لەناو حەرەمی کەعبەی پیرۆزدان، ئیمامی "مەهدی" لە نیوانیاندا بەیعەی پێدەدرێت و دەکرێتە خەلیخەی موسلمانان مەرج و نیشانەیە دەبێت ئیمام هەر لەو نێوان ئەو دوو جێگایەبەیعەتی پێبدرێت. بەبێ بوون لەوجێگایەدا بەیعە بەکەس نادرێت تاکو بکرێتە خەلیفە.

**یەکەم: لە دوای مردنی پاشا یان خەلیفە.**

سێ کوڕ هەرسێکیان کوڕە پاشا و مەلیکن دەبێتە شەڕیان لەسەر کەنز. جا ئەم کەنزە بەشێک دەڵێن (کنزی کەعبە)یە، هەروەها بەشێك تردەڵێن (نەوتە)، واللە تعالی أعلم.

**دووەم: مەوسیمی حەججە، واتە کاتەکەی چی کاتێکە؟**

جەژنی قوربانە، ئنجا لەو ساڵەدا زۆرترین حاجی دەکوژرێن و دەبنە قوربانی. تەنانەت لە هەندێک فەرموودەدا دەڵێت خوێن وەکو جۆگەلە دەڕوات!

ئەم دوو خاڵە زۆر گرنگن، بۆیە جوان خەزنی بکەن، چونکە مەرجن واتە بێ ئەم مەرجانە هەرگیزا و هەرگیز ڕوونادات. ئێستا زانیمان لە چی بارودۆخێکدایە کاتەکەی و چی شتێک ڕوویداوە. لێرەدا ٧ زاناکە کە ژمارەیان ٧ زانایە اللە تەنیا خۆی دەزانێت نهێنی ئەم ژمارەیان. لەم باروودۆخەدا دەردەچن و بەرەو مەککە دەکەونە ڕێ. ئنجا بزانن هەریەکێکیان لە وڵاتی جیاوازەوە بێت پەیوەندییەکی پێشوەختەیان هەیە. ئنجا بەسەرسوڕمانێکەوە بەیەکتر دەڵێن چی شتێک ئێوەی هێناوە بۆ ئێرە!

ئەم حەوت زانایە کێن، واتە چی سیفەتێکیان تێدا هەیە؟

بەڵێ، لێرەدا ئەمانە وەکو ناوی خۆیان شارەزان لە مەسائیلی مەهدیدا و شارەزای زەمانی و مەکانی و ناوی نەسبی "مەهدی"ن. زۆر بەوردی و لەگەڵ شارەزابوونی ورد لەڕووداو و پێشهاتەکاندا، واتە مەرج نییە لە مسائیلی فقهی و شرعی زۆر شارەزابن. بەڵکو لە (أشراط ساعة)دا بێوێنە و کارامەن کە اللە تایبەتی کردوون. بەڵام لەبارەی عەقیدەوە عەقیدەیەکی پاک و بێگەردیان هەیە و ئەهلی سونە و جەماعەتن.

**مەشهەدی کۆتایی: چۆن بیعەت دەدەن؟**

لە سەرەتادا کەسێک لە "مەدینە"وە ڕادەکات بەرەو "مەککە" تەبعەن بارودۆخەکەمان بۆ باسکردوون کە چی خوێنێک ڕژاوە. لێرەدا ئەم ٧ زانایە بە یەکتر دەڵێن: چی شتێک ئێوەی بۆ ئێرە هێناوە! ئەوانیش بەیەکتر دەڵێن: هاتووین بۆ دۆزینەوەی ئەو کەسەی کە ناوی ئەوەیە و ناوی باوکی و دایکی، هەروەها پێشمانوایە ڕزگارکەر و هەدی و ئازادکەری "قسطنطینیە"یە. ئنجا دەیانەوێت بیعەتی پێ بدەن، بەڵام ڕازی نابێت لە دەستیان ڕادەکات دەچێتە "مەدینە" لەوێش پێی دەگەن دیسانەوە ڕادەکات.

چەند جارێک تاکو لەکۆتاییدا لەنێوان "روکن" و "مقام"دا پێی دەڵێن یان لە ملت دەدەین یان دەبێت ڕازی بیت. بۆیە بە (إکراه) واتە بەزۆر بیعەتی پێدەدەن. لێرەدا دەمەوێت پێتان بڵێم "مەهدی" بۆیە ڕازی نییە، چونکە لە هەڵگرتنی ئەم ئەرکە قورسە دەترسێت.

**تێبینی:**

زانایان لە کۆن لەبارەی ئەم هاتووچۆیەی نێوان "مەککە" و "مەدینە" لەوکات دەیانووت الله (کرامات) دەدات بە مەهدی، چونکە چۆن دەتوانێت لە ڕۆژێکدا سەدان کێلۆمەتر ببڕێت! بەڵام لە ئێستادا وەسائیلی هاتووچۆ پێمان دەڵێت (کرامات) نییە، بەڵکو گۆڕانکارییە. ئەمە پووختەیەکی ووردو گرنگ بوو لەبارەی بەیعەتەوە کە زۆر گرنگە.



## بەشی دووەم

الحمدلله سوپاس بۆ خوای تعالی توانیم لە چەند زنجیرەیەک باسی (محمدی مهدی) بکەم بەکورتی و پووختی کە خۆی دەبینێتەوە لە نۆزدە زنجیرە لێرەدا هەوڵمدا ئەو شتانەی کە گوماناوین و باسنەکراوبوون باسیان بکەین. بەشێکیان پێشتر قسەی لەسەر کراوە، بەڵام بەشێکی زۆریان بەشێوەی دەگمەن لەنێو کورد والله اعلم، ئاوا قسەی لەسەر نەکراوە. الحمدلله زۆرترین سەرچاوە و پوختەی فەرموودەکانیشم بەکورتی باسکردووە یەک بەش الحمدلله بێ بەڵگە قسەم لەسەری نەکردووە ڕاستە عەرەبیەکەم لەبەشێکیان نەنووسیوە، بەڵام پوختەی کوردیەکەم بۆ داناون و هیچ کەسێک مەعصوم نییە و بێ هەڵەبێت، بێگومان ئێمەش هەر مرۆڤین. داواکارم لە الله تعالی بیخاتە میزانی حسنات و کفارەت للسیئات بێت و هیوادارم بەوردی بیخوێننەوە. بۆیەش تا ئێرەم باس کرد پێویست بەباسی حوکم ژیان لەسەردەمی "مهدی" ناکات چونکە والله تعالی اعلم گەرتەمەن باقی بێت بەعەمەلی حوکمی محمدی مهدی دەبینین، بإذن الله...

### زنجیرەی حەڤدەیەم: پلەو سیفەتی پشتیوانانی إمام مهدی.

با بزانین ئەم سیفەتانەمان هەیە؟

سیفەتی ئەوانەی کەوا دەبن بە پشتیوانی ئیمام (الأتقیاء مهدی) چین؟

لەسەرەتادا دەمەوێت بیرتان بێنمەوە هەر پێغەمبەرێک علیهم السلام یان سەرکردەیەکی مەزن بێت، ئەوا الله تعالی دڵی کۆمەڵێک لە کەسانی تایبەتی بۆ موسەخەر دەکات و دەبنە سەرخەر و پشتیوانی، هەروەک نمونەی عیسى علیه السلام (للحواریون من أنصار إلی الله) و نمونەی پێغەمبەری خۆمان (نبی الملحمه)، چۆن دڵی کۆمەڵێک هاوەڵی پڕشکۆی بۆ

موسەخەرکرد تاوەکو ببنە پشت و پەنای هەرچەند ﴿أليس الله بكاف عبده﴾[1] بەڵام ئەمانە ئامرازی سەرکەوتنن.

پشتیوان دووبەشن تایبەت و گشتی.

**یەکەم: تایبەتیەکان کێن؟**

لە پوختەی سەرجەم ڕیوایەتەکاندا ئەمە وەسفیانە، ئەوانیش لەگەڵ ٧ زانا یان ٩ ژمارەیان بەقەد جەنگی (بەدر) یان هاوەڵانی "طالوت"ن کە لێکیانداوەتەوە بە ٣١٣ کەس ئەمانە لەنێوان "الركن" و "المقام" بەتایبەت بیعەت دەدەن بە "مەهدی". با بزانین پلەو سیفەتیان چین؟

١. [لا يسبقهم الأولون]

واتە مەبەست ئەوەیە لە یەکەمەکانی ئەم ئوممەتە (هاوەڵان)ن. کەوا دەڵێت پێشیان ناکەون، واتە پلەیان ئەوەندە بەرزە، والله اعلم.

٢. [ولا يدركهم الآخرون]

واتە پێیان ناگەن ئاخرەکان واتە ئەوانەی دوایی مەبەست (بیعەتی گشتی)یە لە پلە ئەوەندە بەرزن کەوا ئەمەش پلەیەکی تایبەتە بۆیە با دوعابکەین ئێمە یەکێك بین لەو کەسانە.

**سیفەتیان:**

١ سورة الزمر: الآية (٣٦)

١. [رهبان الليل] یان [عابد الليل]

ئەمەش یەکێکە لە سیفەتەکانی هاوەڵان کەوا بە شەو تا بەیان تەنیا بۆ خواپەرستی بوو، واتە ئەوانەی دەبنە شوێنکەوتەی ئیمام مەهدی لە شەودا هەم لە سونەت و هەم لەشەو نوێژدان. جا با وریابین ئەمانە سیفەتی ئەوانەن، بۆیە ئەگەر ئێمەش بمانەوێت تەنیا بە دانیشتن نابێت دەبێت ئاوا هەوڵی بۆ بدەین.

٢. [أسد النهار]

شێری ڕۆژن، واتە بە ڕۆژ لە کەسابەتی حەڵاڵ و پیاوانە بەبێ زەلیلی و شەرمەزاری. بەڵکو وەکو شێرن لە پێناو پەیداکردنی کاسبی حەڵاڵ ئاگاداربین حەڵاڵ.

**دووەم: چینی گشتی.**

وەک لە صحیح "مسلم"دا هاتووە و هەروەها لە کتێبی (الفتن والملاحم)شدا لەبارەی باسی (الملحمە العظمی) لەنێوان کفر و ئیمان لەکاتی شەڕەکەدا سێ چینن.

- سێسەد هەزاری یەکەم کە ڕادەکەن هەرگیز تۆبەیان لێوەرناگیرێت.
- سێسەدی هەزاری دووەم، شەڕ دەکەن تاوەکو کۆتا کەسیان لێ شەهید دەبێت. دەڵێت ئەمانە ڕێزدارترین شەهیدن لای پەروەردگار.
- سێسەدی هەزاری سێیەم، کە شەڕدەکەن تاکو سەرکەوتن بە دەستدێنن. دەڵێت ئەمانە لەدوای ئەم شەڕە هەرگیز توشی فیتنە نابن، واتە وەکو یارانی "بدر" کەوا الله لێیان خۆش بوو. واتە تەنانەت پارێزراون لەفیتنەی "دەججال"یش.

لەکۆتاییدا دەبێت دووعا بکەین بە قەول و عەمەل بە گوفتار و کردار ئەم سیفەتانە لەخۆمان بێنینەدی، ئاگادارېن ئەمانە مەرجن!

## زنجیرەی هەژدەیەم: وەڵامی گومانەکان.

ئایا مەهدی خۆی دەناسێت؟

یاخود ئایا کەس مەهدی دەناسێت؟

یاخود تەنانەت خۆشی خۆی ناناسێت؟

یاخود کێن کە دەیناسن؟

**وەڵام:** بۆ زیاتر تێگەیشتن و ڕونتربوون دابەشی دەکەین بۆ دوو خاڵ.

**یەکەم:** ئایا مەهدی خۆی دەناسێت؟ یان خۆشی نازانێت؟

**دووەم:** کێن ئەوانەی مەهدی دەناسن پێش دەرکەوتن؟

**خاڵی یەکەم:**

دەبێت جیاوازی بکەین لەنێوان دوو شت واتە وای لێهاتووە لە باسی محمدی مەهدی کەسانێک هەن، دەڵێن کاکە وازبێنە تەنانەت خۆشی خۆی ناناسێت! ئەمە گومانە و دروست کراوە ڕاستە یان نا؟

لەوەڵامی ئەم گوومانە دوو بەشە:

**١. ناسینی (نسب)ی خۆی واتە پشت و عەشیرەت.**

بێگومان لە هیچ عەقڵ و مەنطقێکدا نییە کەوا کەس نەزانێت ناوی چییە و کوڕی کێیە و عشیرەتی کێیە. من خۆم تاوەکو نزیکەی دە پشتی خۆم دەناسم هەموو کەسێک ئەم شتە دەزانێت و هیچ گومانی تیا نییە. ئەوەی من مەبەستمە، کەسێک ناوی محمد بن عبدالله بێت و لە ئال و بەیت بێت و (قوڕەیش)ی بێت و سیفەتی "خەلقی" و "خولقی" تێدابێت چۆن خۆی ناناسێت. بۆیە دڵنیابن کەوا هیچ عقڵێک ئەوە قبوڵ ناکات بڵێت تەنانەت خۆیشی نازانێت کێیە!!

زۆرترین گومانەکان لێرەدا ئەوەیە کە دەڵێن ئەم فەرموودە (يصلح الله في ليلة). ئەم فەرموودەیە هیچ پەیوەندی بەوەوە نییە بڵێت کەوا خۆی ناناسێت، الله لە یەک شەو دەیناسێنێت. یەک زانای موعتەبەر ئەم فەرموودەیان بۆ ئەم مانایە لێک نەداوەتەوە. واتە بڵێن خوای گەورە دەیناسێنێت، چونکە ناسراو نەبووە. بەڵکو بۆ ئەوەیە ئەسبابی سەرکەوتن و پاڵپشتی بۆ فەراهم بێنێت بۆئەوەی زیاتر لاتان ڕوونبێت تەماشای زنجیرەی سیانزەیەم بکەنەوە. بۆیە ئەگەر بۆ ناسین بوایە ئەوا وشەی تر بەکار دەهات.

**٢. ئایا دەزانێت کەوا مەهدییە؟**

لە وەڵامدا دەڵێین، ئایا رسول الله دەیزانی کەوا پێغەمبەرە ﷺ؟

نەخێر، نەیدەزانی سەرەڕای ئەم هەموو موعجیزەیەی لە بونییەوە تاکو بوون بە پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ لەدایکبوونی نوور لەدایکی دەرچووە و لە منداڵیەوە چەندین موعجیزەی هەبووە. بەڵام لە کاتی هاتنی وەحیدا بۆڵای زۆر پەشۆکاو لەرز دایگرت، چونکە نەیدەزانی، بەڵام بەهۆی هەندێک نیشانەوە کۆمەڵە کەسێک دەیانناسی. محمدی مەهدیش هەرگیز ناگاتە پلەی پێغەمبەران بەڵام گەورەترین مژدەی ئەم ئوممەتەیە دوای

وەفاتی الرسول، محمدی مەهدییە. بۆیە تەنانەت ئینکاریش دەکات بەڵام دەبێت زیاتر وردبینەوە لە فەرموودەکان.

ئەوەی گرنگە ئەوەیە لەزۆرینەی ڕیوایەکان لەبارەی بەیعەتی (إکراه) لە ترسی هەڵگرتنی قورسایی ئەم ئەرکەیە نەک بڵێیت من هەونیم و سیفەتی مەهدیم تێدا نییە. ئەمە خاڵە هەستیارەکەیە، واتە ناتوانێت ئینکاری ئەوە بکات کە خۆی ناناسێت و نازانێت. چونکە زاناکان دەڵێن تۆ فلانی کوڕی فالانی و ناوی دایکیشت فلانە. بۆنمونە ئەم قەولە دەڵێت، واتە کاتێک زاناکان دەیانەوێت بەیعەتی پێبدەن. فیقول: ویحکم کم عهد قد نقضتموه، وکم دم قد سفکتموه!

واتە پێیان دەڵێت هاوار بۆ ئێوە چەند چەندە پەیمان و بەڵێنتان شکاندووە و چەندە خوێنتان ڕێشتوە!

ئەم فەرموودەیە ئیمام "حاکم" لە (مستدرك) و "نعیم بن حماد" ڕیوایەتیان کردوە. ئێستا بیرۆکەی ئەم گومانەتان لا نەما چونکە ئەمە حەقیقەتەکەیە.

**خاڵی دووەم:**

کێن ئەوانەی محمدی مەهدی دەناسن؟

ئەمەش وەڵامەکەی دەبێتە دوو بەش:

**یەکەم:** تایبەت.

**دووەم:** گشتی.

<u>یەکەم: چینی تایبەت.</u>

واتە بەر لە دەرچوون و بیعەتدان پێی ئاگادارین! ئەم چینە تایبەتەش خۆی دەبینێتەوە لە کەسانی شارەزا بەم بوارە. واتە چینێک هەن شارەزایی سیفەتی خەلقی، واتە دروست کراوی و سیفەتی خولقی واتە ڕەوشتی، لەگەڵ سیفەتی زەمانی و مکانین، چۆن؟

**وەڵام:** نمونەیەک بۆ زیاتر تێگەیشتن و ڕونتربوون، پێغەمبەر محمد ﷺ هەر لە منالییەوە موعجیزە و نیشانەی لێ دیارکەوتووە. یەکێک لەو نیشانانە لە تەمەنی ١٢ ساڵیدا لەگەڵ کاروان دەچێتەدەر پەڵە هەور بۆی دەبێتە سێبەر. دواتر ڕاهیبەیەک دەڵێت: ئەم کوڕە بگێڕننەوە، چونکە ئەگەر جولەکەکان بزانن و بیناسن دەیکوژن ئەوەی من مەبەستمە، تەرکیزتان بخەنە سەر وشەی "ڕاهیبەکە"! بۆچی تەنیا ئەم زانیوویەتی ئەوانەی تریش گەریزانن! لەبەرئەوەی شارەزابوون، هەروەها شارەزابون!! باشە پرسیار دەکرێت چۆن شارەزابوون؟

**وەڵام:** چونکە ﴿یعرفونه کما یعرف أبنائهم﴾[1] واتە لە تەورات و ئینجیل وەسفی کرابوو. هەروەک پێشتر وتم تەنانەت وەسفی هاوەڵانیش کرابوو.

### بۆچی ئەوانەی کە لە گەڵیدابوون درکیان بەم شتە نەکرد؟

چونکە شارەزا نەبوون، کەواتە چینێکی تایبەتی شارەزا ئەم شتانە دەزانن. ئێستاش ئێمە ئوممەتی ئەم پێغەمبەرەین ﷺ، فەرموودەیەکی (صحیحی)مان هەیە لەبارەی ئەوەی ڕۆژێکیان لە مزگەوت لە نوێژی بەیانی تاوەکو عیشا رسول الله ﷺ باسی نیشانە و فیتنەکانی بۆ کردوون، واتە هەمووی. لەیەکێکی تر هاوەڵی بەڕێز "حذیفةبن الیمان" دەڵێت: تاقیامەت پێی ووتم (بما هو کائن)، تەنیا ئەوە نەبێت لێم نەپرسی چی شتێک

---

[1] سورة البقرة: الآية (١٤٦) سورة الأنعام: الآية (٢٠)

خەڵکی مەدینەی لە شارەکە دەردەکات. تەرکیز بکەن واتە هەموو شتێك لەبارەی محمدی مەهدیش، تەنانەت پێمان وتراوە ددانەکانیشی چۆنە، واتە سیفەتە کەسییەکان خاڵ بەخاڵ دیارکراوە. جگە لەوەش پێمان وتراوە تەنانەت لە چی سەردەمێک و کاتێکدا دەردەچێت، واتە سیفەتی زەمانی و مەکانی، چۆن؟

بۆنمونە، دەڵێت لە کاتی ناکۆکی و بوومەلەرزە و شەڕ و کوشتار، تەنانەت دەڵێت لە مەوسیمی حەج و لە هەموویان گرنگتر دەڵێت لەنێوان "روکن" و"مقام"، کەواتە هیچ شتێک نەماوە باسنەکرابێت تەنیا غافڵی و بێ ئاگایی خۆمان نەبێت. بەڵێ، چینێکی شارەزا و ئاگادار دەیناسن ودەزانن، بۆ نمونە کەسێك پەیدابووە ئەو سیفەتانەی وتراوە لەسەری لێکی دەدەینەوە، دواتر دێین سەیری گۆڕانە زەمانی و مەکانیەکان دەکەین. واتە بە وردی لەلایەن ئەم چینەوە لێکۆڵینەوەی بۆ دەکرێت. ئێوە بهێننە پێشچاوی خۆتان لەناو ملیۆنان کەس چەند سەد کەسێک دواتر بڕۆینە جیهان لەنێو ملیارەها چەند ملیۆنێک، زۆرکەمە ئەم ژمارەیە.

<u>دووەم: چینی گشتی.</u>

ئەم چینە گشتییە، دوای (خسف الجيش) شارەزا دەبن و بۆیان دەردەکەوێت کە محمدی مەهدییە. ئەم چینە گشتیەش بۆ موسڵمانە.

داواکارم لە الله لە هەڵەکانم ببورێت و هیوادارم توانیبێتم شتێک ڕوونبکەمەوە و من مرۆڤم هەڵە دەکەم. بۆیە ئەوەی دەلیلی بەهێزتری هەیە بۆمان داینە و ئێمەش موقارەنەی دەکەین گەر موقنیعتربوو سمعنا وأطعنا.

## زنجیرەی نۆزدەیەم: کێن ئەو ئەنصارانەی کەوا خیانەت لە "مەهدی" دەکەن؟!!

لەم بەشەدا کە کۆتا بەشی زنجیرەکەیە هەوڵدەدەین باسی یەکێک لە گرنگترین و هەستیارترین مەوقیف و بابەتەکەتان بۆ بکەین. گرنگە لەبەرئەوەی هەموو دەڵێین مەهدی بێت بە دوای دەکەوین، بەڵام بەشێکی زۆر هەڵدەگەڕێنەوە و خیانەت دەکەن. بۆئەوەی باشتر و چاکتر لەم بەشە تێبگەن، دوو نمونەتان بۆ دەهێنینەوە کەوا هەمان مەوقیفە و ڕوویداوە.

### یەکەم: طالوت

بەکورتی و پوختی بۆتان باس دەکەین. لە قورئاندا الله تعالى بۆمان باس دەکات لە سورەتی (البقرە)دا. لەدوای "موسا" علیه السلام، بەنی ئیسرائیل داوا لە پێغەمبەرەکەیان دەکەن کە موفەسیران دەڵێن ناوی "شمویل"بووە علیه السلام پێیدەڵێن: پاشایەکمان بۆ بێنە تاوەکو جیهادی (فی سبیل الله) لەگەڵدا بکەین. ئەمیش دەڵێت دیارە بیرتان چووە پێشتر ئەمرتان بۆ هاتووە و بەڵام نەتانکردووە. دواتر دەڵێت: خوای گەورە "طالوت"ی وەکو مەلیک بۆ داناون کە لە عیلم و جسم لەوپەڕییە. دواتر دەچن ڕووبەڕووی "جالووت" ببنەوە کە ئەمیش یەکێکە لە مەلیکە (جبار)ەکانی ئەو کاتە.

موفەسیران وەك "ابن کثیر" و "قرطبی" لە (سدی) هێناویانە دەڵێن ژمارەی سەربازەکانی طالوت ٨٠ هەزار بووە بەر لە گەیشتنیان بە دوژمن پێیان دەڵێت: خوای تعالى بە ڕووبارێک تاقیتان دەکاتەوە، موفەسیران دەڵێن نێوان ئەردن و فەلەستینە، والله اعلم.

پێیان دەڵێت ئەوەی بیخواتەوە لە ئێمە نابێت. لێرەدا بۆ زیاتر دەرخستنی ئاستی بەرگە گرتنیان بەرامبەر بە ئاوێک، چونکە دوایی ڕووبەڕووی یەکێک لە هەرە بەهێزترین دوژمنی زەوی دەبنەوە، بەڵام زۆربەی زۆریان لێی دەخۆنەوە. موفەسیران دەڵێن ٧٦ هەزار لە ئاوەکە دەخۆن و توانایان نامێنێت و سەرپێچی دەکەن. تەنیا ٤ هەزار دەمێننەوە. لەم چوار هەزارە هەیانە نەیخواردووەتەوە و هەشیانە کەمێکی خواردووە. لەکاتی بینینی جیشی گەورەی دووژمن "جالووت" زۆربەیان لەترسدا چۆکیان دەشکێت و ڕادەکەن! موفەسیران دەڵێن لەم چوار هەزارە تەنیا سێ سەد وشتێک دەمێننەوە، دەیان زیاتر بەقەدەر ژمارەی "بەدر"یان لێماوەتەوە بە فەرموودەی (صحیح). دواتر هێرشیان بەناوی الله بردە سەریان، "داوود" جالووت دەکوژێت.

چۆن عیبرەت لەم بەسەرهاتە حەقیقییە وەربگرین؟

١- خۆیان داوایانکرد لەبەرئەوەی ستەمیان لێکرابوو.

٢- لەکاتی تاقیکردنەوە صەبریان نەگرت ئاوەکەیان خواردەوە.

٣- لە ٨٠ هەزار جەیش تەنیا سێ سەد و شتێک ماون.

کێن کە بەرگەی هەردوو تاقیکردنەوەکەیان گرت؟

- ئیمانداران
- موحیدان
- موخلیصان
- صابران
- شاکیران

واتا تەنیا ئیمانداره ڕاستەقینەکە ماوە.

کێ بوون ئەوانەی هەڵاتن و سەرپێچی تاقیکردنەوەکەیان کرد؟

- مونافیقان.
- موفسیدان.
- بێ ئارام و ئیمان لاوازەکان بەرگەیان نەگرت.

**دووەم: محمد الأمین ﷺ، جەنگی "ئوحود".**

بەکورتی، ئەم جەنگە دوای جەنگی "بدر" هات کە موشریکانی "مەککە" هەڵسان بەکۆکردنەوەی سێ هەزار جەنگاوەر، کەوا ژنیشیان تێدابوو. دواتر موسڵمانان بەسەرکردایەتی رسول الله ﷺ بۆیان دەرچوون. ژمارەی موسڵمانان هەزار سەربازبوون، لەکاتی گەیشتنیان بەدوژمن و بینینی ژمارەیان، لەم کاتەدا سەرۆکی مونافقان "عبدالله کوڕی ئووبەی کوڕی سلول" دەکشێتەوە و ڕادەکات و لەگەڵیدا ٣٠٠ کەس لە مونافقان هەڵدێن. بەمەش موسڵمانان ژمارەیان کەم دەبێتەوە.

**عیبرەت وەرگرتن:**

ئەوانەی کەوا بەحساب بەڕووکەش موسڵمان بوون لەگەڵ جیشی موسڵمانان بوون، کەچی خیانەتیان کردووە، کێ بوون؟

١. مونافقان بوون
٢. درۆزنەکان بوون

٣. ئەوانەی کەوا ئیمان نەچووبووە دڵیانەوە. واتا ئیماندارى ڕاستەقینە و موحیدى تەواوەتی نەبوون.

ئێستا بابەتەکەمان لەسەر مەهدییە. ئیمامی "مسلم" لە کتێبی (الفتن والملاحم)دا هێناویەتی، ئەوانەی کەوا شەڕی ڕۆم، لێرەدا واتە مەهدی دواین شەڕی ئیمانداران بۆ گرتنی "قوستەنتینییە" پێش "دەججال" ڕۆم لەژێر ٨٠ ئاڵاوە دێن لەژێر هەر ئاڵایەک ١٢ هەزار سەربازە. موسڵمانانیش بەم ژمارەن، واتە جەیشی "مەهدی". لێرە دەمەوێت پێتان بڵێم لەکاتی یەکەم ڕووبەڕووبونەوەدا لەنێوان سوپای ئیمام "مهدی"و ڕۆمدا، ڕۆمیش (ئەمریکا و ئەوروپا) دەگرێتەوە. ٣٠٠ هەزار لە جەیشی "مهدی"، واتا ئەوانەی بەحساب پشتیوان و سەرخەری "مەهدین". لێرەدا خیانەت دەکەن و هەڵدێن، کاتێک ڕۆم دەبینن هەڵدێن، ئەم ژمارەیە هەرگیز خوای گەورە لێیان خۆش نابێت، واتە (خسیر الدنیا والاخرا). دواتر ٣٠٠ هەزاری تر لە جیشی "مهدی" دەچنە پێش و شەڕدەکەن هەموویان شەهید دەبن ئەمانە بەرێزترین شەهیدن لای خوای تعالی.

## چۆن عیبرەت و ئامۆژگاری وەربگرین؟

لێرەدا ئەم ژمارە زۆرە هەڵگەڕانەوە و خیانەتیان کرد واتە خیانەت دەکەن، کێن؟

بێگومان مونافقان و موفسیدان و درۆزن و ئیمان لاوازەکانن. ئەوەی من مەبەستمە لەم بەشەدا پێتان بڵێم ئەم باسە لە داهاتووە، واتە لەوانەیە والعیاذ باالله ئێمەش بین. کەواتە دەبێت بەردەوام دوعای ئەوە بکەین لەم کۆمەڵە نەبین، چونکە بەحساب (انصار) پشتیوان "مەهدین" چەندین ساڵە خۆیان بۆهاتنی دانابووە!

## چی پێویستە بۆئەوەی لەم کۆمەڵە نەبین؟

- ئیمانێکی خالیصەن بۆ الله.
- تەقوا و صەبر و ئارام گرتن.
- زۆر دووعاکردن و شەو نوێژکردن.
- دوورکەوتنەوە لەهەموو جۆرە زیادکراوێک (بدعة).

داواکارم لە الله بمانکات بە یەکێک لەوانەی شەهیدن، لەهەڵە و کەم و کوڕییەکانیشمان ببورێت، بۆیە با ئیمانمان بکەینە قەول و عەمەل.

## زنجیرەی بیستەم و کۆتایی: (خسف الجيش).

یان دەتوانین بڵێین نیشانەی گشتی، چونکە یەکێک لە گەورەترین نیشانەکانی ناسینەوەی مەهدی علیه سلام بۆ عەوامی خەڵک ڕۆچوونی ئەم سووپایەیە. کاتێک مەهدی علیه سلام و ئەنصارەکانی پەنای بۆ (بەیت) بردووە، واتە دوای بیعەتی نێوان ڕوکن و مقام. ئنجا لەم کاتەدا جەیشێک بەڕێ دەخرێت لەلایەن تاغوتێک و زۆردارێکەوە کە نازناوی سوفیانییە بۆ لەناوبردنی (إمام الجهاد والتوحيد) مەهدی علیه سلام. بەڵام لەڕێگا کاتێک دەگەن بە (بيداء الأرض) زۆرینە دەڵێن زەوییەکانی مەدینەن لەم کاتەدا ڕۆدەچن بەناخی زەوی، ئنجا لەناوەڕاستی سوپا هاواری بۆ کۆتاییەکەی دەکات. بەڵام هەموویان نقوومی زەوی دەبن جگە لەیەکێک نەبێت بۆ گەیاندنی هەواڵەکە. هاوەڵان ووتیان: ئەم ڕێگایە خەڵک زۆر لێی کۆدەبێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، ڕێبوار و زۆرلێکراوی تێدایە، بەڵام هەموویان پێکەوە بەیەک لەناوچوون لەناودەچن و لەقیامەتیش لەسەر نیەتیان زیندوو دەکرێنەوە.

**صحیح بخاری، کتاب (البیوع):**

عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (يَغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ، فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الْأَرْضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ. قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ وَفِيهِمْ أَسْوَاقُهُمْ، وَمَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ ؟ قَالَ: يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ، ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيَّاتِهِمْ).

واتە لە دایکمان عائیشەوە الله لێی ڕازی بێت لەخۆی و باوکی، رسول الله ﷺ فەرمووی جەیشێک دەجەنگێت لە کەعبەدا، واتە بەرەو ڕووی ئەم شوێنە دەچێت. کاتێک دەگات بە"بیداء" ناوچەیەکی ناسراوە، ئەوا لەسەرەتا تا کۆتایی نقوومی زەوی دەبن. منیش ووتم: ئەی رسول الله چۆن لەسەرەتا تا کۆتایی، واتە هەموویان بەیەکەوە (خسف) دەبن، لەکاتێکدا کەسانێکی تێدایە ڕێگایان لەوێیە یان بۆ تیجارەت یان بۆ هاتووچۆ. فەرمووی هەموویان لەسەرەتاوە تا کۆتایی نقووم دەبن و دواتر لەسەر نیەتیان زیندوو دەبنەوە.

**شێخ "إبن حجر العسقلانی" لە (فتح الباری)دا دەڵێت:**

فوقع الجواب بأن العذاب يقع عاما لحضور آجالهم.

لەبارەی سزای ئەوەی هەموویان بەیەک لەناوچوون لەناودەچن، واتە سزایەکی گشتییە بۆ هەموو ئەوانەی لێی ئامادەبوون.

کەواتە ئەمە دەلالەت و ئاماژەیە بۆئەوەی دەبێت دوورکەوینەوە لەم شوێنانە. کاتێک جەیش بۆ لەناوبردنی مەهدی علیە سلام بێت تۆش لەوێ بیت. لەفەرموودەیەکدا دەڵێت: يهلكون مهلكه واحدا.

واتە بەیەک لەناوچوون لەناو دەچن.

**سنن أبي داود كتاب (المهدى):**

عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، بِقِصَّةِ جَيْشِ الْخَسْفِ، قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهًا؟ قَالَ : (يُخْسَفُ بِهِمْ، وَلَكِنْ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ).

ئەم فەرموودەش بەهەمان شێوەی فەرموودەکانی ترە جەیشێک بەرێ دەخرێت بۆ "کەعبە"، ئەم سوپایە خەسفی زەوی دەبێت. ووتم ئەی رسول الله ﷺ، چی دەربارەی ئەوانەی بەزۆر لەوێن. فەرمووی: لەگەڵیان (خسف) دەبن، بەڵام لەقیامەت لەسەر نیەتیان زیندوو دەکرێنەوە.

کەواتە لەکۆتایی دەبێت بزانن یەکێک لەگەورەترین برهان و رووداوی مێژوویی ئەم (خسفە)یە، چونکە سووپایەکی زۆر گەورە نقومی زەوی دەبن.

**والحمد لله رب العالمين**

